# مامۆستای 7 هونەر

گفتوگۆیەکی هەمەلایەنە لەگەڵ

**عەباسی کەمەندی**

**سازدانی: بەرهەم عەلی**

ناوی کتێب: مامۆستای ٧ هونەر...
گفتوگۆیەکی هەمەلایەنە لەگەڵ عەباسی کەمەندی
نووسینی: بەرهەم عەلی
ناوەڕۆک: گفتوگۆی رۆژنامەوانی
تایپ و هەڵەگری: فەرهاد ئەکبەری
نەخشەسازی: ئاراس ئەکرەم
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٩
لەچاپدانی: چاپخانەی کارۆ- سلێمانی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکانی هەرێمی کوردستان، ژمارەی سپاردنی (٤٩٥)ی ساڵی ٢٠١٩ی پێ دراوە.

"زستانان هەر کە بەفرەکە تێتە خوارەوە من تەواوی بەدەنم ئەبێ بە قەڵەم و فڵچە بۆ نیگارکێشان، ئەبێ بە پایز شیعرنووسینم پێ خۆشە، پایز زیاتر بە ئەدەبیات و شیعرەوە سەری خۆم گەرم ئەکەم، بەهار گۆرانیم پێ خۆشە، هاوین نووسینی چیرۆک و ئەو شتانەم پێ خۆشە، یانی وەرزەکانە کە هەستی من ئەگۆڕێ و بەرەو ئیشێکی تر و بوارێکی تایبەتی ئەبات".

عەباسی کەمەندی

# پێشەکی

ئـەم کتێبـەی بەردەسـتتان، دیمانەیەکـی ڕۆژنامەوانیـی زۆر تایبـەت و تێـر و تەسـەل و دوور و درێـژ و هەمەلایەنەیـە، لەگـەڵ مامۆسـتای حەفـت هونـەر، ڕۆشـنبیری گـەورە عەباسـی کەمەنـدی، کـە دوو سـاڵ زیاتـر بـەر لـە کۆچـی دوایـی لەگەڵـی سـازم داوە بـۆ هەفتەنامـەی (بـاس) و تـا ئیسـتاش دەنگەکەیـم بـە تۆمارکـراوی لای خـۆم پاراسـتووە.

دەکـرێ نووسـەران و هونەرمەنـدان و ڕۆشـنبیرانی زۆربـەی بـوارەکان، سـوودی زۆر لـە ڕا و بۆچـوون و ئەزموونـی دەوڵەمەنـد و کەموێنـەی وەربگـرن، مەخابـن ئـەو ڕۆژەی گفتوگۆکەمـان سـاز دا، دۆخـی تەندروسـتیی بـاش نەبـوو، دەنـا هێشـتا دەمتوانـی لەبـارەی زۆر بابـەت و بەرهەمیـەوە، لەمـەی ئێسـتاش دەوڵەمەندتـری بکـەم، چونکـە کەمەنـدی دەریایەکـی بـێ بـن بـوو لـە مێـژوو و کەلەپـوور و ئـەدەب و هونـەردا.

دڵنیـام لـەوەی زۆربەتـان بـە نـاوی عەباسـی کەمەنـدی ئاشـنا بـوون و خۆشـتان دەوێ، گەلێکیشـتان دیمانـە و گفتوگـۆی پێشـتری ئـەم هونەرمەندەتـان بینیـوە، بـەڵام کـەم دیمانـەی هەیـە وەک ئەمـەی بەردەسـتتان دەوڵەمەنـد بێـت بـە زانیـاری، هەروەهـا شـتی نـوێ و نەبیسـتراو و بەسـوودی تێدابـێ.

دەمەوێ ئەوەش بڵێم، کە لە کۆتایی ئەم کتێبەدا چەند وتارێکی تێدایە لەبارەی هونەر و ئەدەبی کەمەندی لەلایەن خۆم و چەند نووسەرێکی ترەوە نووسراون و دوای کۆچی دوایی ئەم هونەرمەندە مەزنە لە هەفتەنامەی (باس)دا بڵاومان کردووەتەوە، بە گرنگم زانی لەم کتێبەدا هەبن.

بە پێویستیشی دەزانم، کە خوێنەری بەڕێز لەوە ئاگەدار بکەمەوە، بەشی کۆتایی ئەم کتێبە ئەلبوومی وێنەکانە، کە زۆربەی کارە هونەرییەکانی بواری نیگارکێشی و بووکەڵەسازی و هەروەها بەرگی بەرهەمە چاپکراوە ئەدەبی و مێژوویی و کولتوورییەکانی مامۆستا کەمەندیی لەخۆ گرتووە، لەگەڵ چەند وێنەیەکی تایبەتی قۆناغەکانی ژیانی، پێوەند بەم وێنانە سوپاسی تایبەتی یەکە یەکەی ماڵباتی کەمەندی دەکەم، بەتایبەتی خاتوو سەمیرە کەمەندیی کچی کە ئەرکی کێشا بە ناردنی ئەم وێنانە بۆم.

ئەم پێشەکییە زیاتر درێژە پێ نادەم، چونکە دەمەوێ ئەو پێشەکییە بخوێننەوە کە لە هەفتەنامەی (باس)دا بۆ دیمانە ڕۆژنامەوانییەکەم نووسی.

بەرهەم عەلی

## پێشەکیی دیمانەکەی هەفتەنامەی (باس)

زێدەڕۆیی ناکەم ئەگەر بڵێم: لەو ڕۆژەوە کە دەستم داوەتە ئەم کارەی ئێستام، چ لە تەلەفزیۆن یان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان، یەکێک لە ئاواتە هەرە مەزنەکانم، ئەوە بوو گفتوگۆیەک یان دیدار و دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانی بەدڵی خۆم، لەگەڵ هونەرمەند عەباسی کەمەندی ساز بدەم، ئەوە ئەمڕۆ ئەو ئاواتەم هاتە دی، رەنگە بپرسن بۆچی کەمەندی؟

سالآنێکە ئیدی وام لێ هاتووە چێژ لە هەندێ گۆرانی وەربگرم، گەلێ گۆرانیی گۆرانیبێژانی کورد و عەرەب و فارس و تورکیش کارم لێ دەکەن و چێژم پێ دەبەخشن، هەندێ گۆرانییش تێکەڵ بە بیرەوەرییەکم بوون و تا مردن لێم جیا نابنەوە، بەڵام دەنگی هیچ گۆرانیبێژێک، هێندەی دەنگی کەمەندی کارم لێ ناکات، هەر وەخت و لە هەر بارودۆخێکدا بووبم، کە گوێم لە گۆرانیی عەباسی کەمەندی دەبێ، بێدەنگ دەبم.. دەمەوێ زۆرترین چێژ لەو دەنگ و هونەرە وەربگرم، کە گوێم لە سترانەکانی کەمەندی دەبێ زۆر شانازی دەکەم کە کورد و هاونەتەوەی ئەم پیاوەم.

ئاخر گۆرانییەکانی کەمەندی ئەوەندە بە هەستێکی کوردەوارییانە دەگوترێن، بە هیچ کەسێکی غەیرە کورد ناوترێنەوە، ئەمە جیا لەوەی هەموو هونەرمەندێکی کوردیش بوێریی ئەوەی نییە خۆی لە قەرەی گوتنەوەی گۆرانییەکانی بدات.

مـن هەسـت دەکـەم، کەمەنـدی کـە دەسـت بـۆ شـیعر و ئـاواز دەبات، وەک ئـەوە وایـە دەست بۆ شتێکی زێدەناسک بـەرێ. ئاخـر ئـەم پیـاوە دڵ سـپی و روح و رووخسـار جـوان و ریـش و پـرچ درێـژە، خـاوەن رۆشـنبیرییەکی هونـەری و ئەدەبـی و مێژوویـی باڵایـە. کـە دەیدوێنـی هەسـت دەکەیـت، هەرچـی لـە رەسـەنایەتی و مێـژووی کەلەپـوور و فۆلکلـۆر و کولتـووری کوردەوارییـدا هەیـە، شـارەزایە تیایدا.

تـا سـاڵانێکیش بـەر لە ئێسـتا مـن تەنیـا وەک گۆرانیبێژ ناسـیبووم، چوزانـم ئـەم دەروێشـەی هونـەری کـوردی، هـەم شـاعیر و هـەم گۆرانیبێـژ و هـەم ئاوازدانـەر و هـەم چیرۆکنـووس و هـەم نیگارکێـش و لەمێـژووزان و هـەم کادیرێکـی لێهاتـووی بـواری فیلمسـازی و دۆبـلاژ و کاری رادیۆیـە و خەمخۆرێکـی گـەورە و کۆکەرەوەیەکـی لێهاتـووی لێمـاوەی فۆلکلـۆر و کەلەپـووری کوردەوارییـە.

خەڵـک دەڵێـن: عەباسـی کەمەنـدی گۆشـەگیرە، جـا توخـوا گۆشـەگیرییەک کـە ئـەم هەمـوو بەرهەمـە جوانـەی بـەدواوە بـێ، بـۆ نەبـێ؟ ئاخـر کەمەنـدی چـی لـە پەیوەندیـی گەرموگـوڕی کۆمەڵایەتـی بـکات، کـە هەمـوو سـاتێکی گۆشـەگیرییەکانی داهێنـان بـێ، ئەمـەی دەیخوێننـەوە گفتوگۆیەکـی زۆر تایبەتـە لەگـەڵ ئـەو مرۆڤـە، نازانـم بـە چەنـد ئەڵقـە کۆتایـی دێ، بەشـێک یـان زۆر لـە قسـەکانیم هـەر بـەو شـێوەزارە نیوەسـۆرانی و نیوەهەورامییەکـە گواسـتووەتەوە، کـە خـۆی پێـی دەدوێ و گۆرانیـی پـێ دەچـڕێ.

## له منداڵییەوە دەستم پێ کرد

**(پ): ڕەنگــە لایەنــی کۆمەڵایەتــی و خێــزان و ســاڵی لەدایکبــوون و پیشــە و کار و گوزەرانــت، لایەنگەلێکــی نادیــار بــن لای خوێنــەران، چــی دەڵێــی لەوێــوە دەســت پــێ بکەیــن؟**

عەباســی کەمەنــدی: بــۆ نــا؟ مــن بــە ســاڵی ئێرانــی ١٣٣١ لــە سنە لەدایک بــووم، پێــم وابــێ بــە ســاڵی میــلادی ئەوێتــە ١٩٥٢، لــە خوێندنــدا لــە دوو مەرحەلــە توانیــم دیپلــۆم وەربگــرم، ئیــدی بەهــۆی نەبوونــی قودرەتــی ماڵــی، نەمتوانــی ئیدامــەی پــێ بــدەم، یانــی زۆر پێــم خــۆش بــوو ئیدامــە بــدەم، نەمدەتوانــی بەبــێ ئیشــکردن بژیــم و بخوێنــم، بۆیــە هــەر بــە دیپلــۆم و کلاس دوانــزەوە لــە رادیــۆی سنــە دامــەرزام، بــەڵام لای خۆمــەوە بــە شــێوەی ئــازاد ئەدەبیــات و مێــژووم خوێنــد و شــارەزاییم پەیــدا کــرد. لــە تەمەنــی ٢٣-٢٢ ســاڵیەوە ژنــم هێنــا، ئەلعــان ســێ کــچ و کوڕێکــم هەیــە.

**(پ): (تەمەن درێژ بن) ئەوان بە چییەوە خەریکن؟**

عەباســی کەمەنــدی: کچێکــم لــە دانیشــگای ئورمیــە هەندەســەی ســاختمانی دەخوێنێ و زۆری نەماوە دەبێتە موهەندیســی ســاختمانی، کچێکــی تــرم لیسانســی ئەدەبیاتــی وەرگرتــووە هــا لــە تەلەفزیونــی سنــە، کچێکــم شــووی کــردووە و خانــەدارە هــا مــاڵ خوەیــا منداڵێکــی

هەیە، کوڕەکەیشم کە ها لای خوەمە، ئەویش هەر وەکوو خۆم لەبەر قودرەتی ماڵی، نەیتوانی زیاتر لە دیپلوم بچێتە پێش.

**(پ): ئەوان منداڵی باوکێکن، لە زۆر بواردا بەرهەمدار و هونەرمەندە، ئاخۆ کەسیان ئولفەت یاخود بەهرە و سەلیقەی هونەرییان هەیە، کاری هونەری دەکەن؟**

عەباسی کەمەندی: من پێم خۆش نەبوو بەزۆر ئەمانە بکێشم بە لای هونەردا، بەڵێ سەرنجم دان و تێیاندا گەڕام بزانم ئاخۆ کامیان هونەر لە وجوودیانا هەیە، ئاخر بەهرەی هونەری هەرکەس هەبێ خۆی هاوار ئەکا و ئەچێتە پێشەوە، ئەگەر خۆی تیای نەبێ، کەس ناتوانێ هونەرمەندێک ساز بکا، بەڵام کوڕەکەم لەم تەمەنەدا، یەک دوو مانگێکە خەریکی فێربوونی سێ تارە.

**(پ): ڕەنگە زۆریەی خوێنەران، عەباسی کەمەندی تەنیا وەک گۆرانیبێژ بناسن، ڕەنگە کەم کەس بزانن کە ئێوە لە بوارگەلی رادیۆ و تەلەڤزیۆن و ئاواز و شیعر و مێژوو و کەلەپوور و نیگارکێشیشیدا جێدەستتان دیارە، ئەگەر لەمبارەیەوە قسەمان بۆ بکەیت؟**

عەباسی کەمەندی: من کارمەندی رادیۆ و تەلەڤزیونی سنە بووم، ئێستاش خانەنشینم، واتە مووچەی خانەنشینی وەردەگرم

و بـەوە دەژیـم. بـەڵام ئیشـی هونەرییـم لەمێـژەوە دەسـت پـێ کـردووە، یانـی لـە تەمەنـی زۆر خـوارەوە، لـە تەمەنـی ١٤-١٥ سـاڵیدا و کەمێـک پێشـتریش ئـەو هەسـتەم کـرد کـە شـتگەلێ لـە وجوودمـا هـەن، هەسـتم دەکـرد هەڵئەقوڵێـن، پێـم خـۆش بـوو، بـە جـۆرێ لـە جـۆرەکان ئـەم شـتانە بێرمـە سـەر دیمـەن بێرمیـە بەرچـاو، بـەڵام نەمئەزانـی چـۆن، تاوەکـوو وردە وردە بـە نیگارکێشـی و شـێوەکاری و بـە نووسـینی شـیعر دەسـتم پـێ کـرد، لـە تەمەنـی هـەژدە سـاڵیدا بـووم، ئیتـر موسـابەقەیەک لـە رادیـۆی سـنە سـاز درا، کێبەرکێیـەک بـوو بـۆ نووسـەرانی نێوخۆیـی، منیـش بـە چیرۆکێـک، بـە مەنزوومەیەکـی دڵبزوێنـی رۆمانتیکـی بەنـاوی (شـەوبۆ و حەمەشـوان)ەوە، بەشـداریی ئـەو کێبەرکێیـەم کـرد، ئـەو چیرۆکـە بـۆ ئـەو دەمـە زۆر بـاو و گونجـاو بـوو، بۆیـە بـووە ئەوەڵیـن هەنـگاوم.

## شەش هەزار لاپەڕەی وێنەگیراو

**(پ): واتە (شەوبۆ و حەمەشوان) چیرۆکی رادیۆیی بوو؟**

عەباسـی کەمەنـدی: بەڵـێ بـۆ رادیـۆی سـنە بـوو، دوای ئـەوە ئیتـر مـن دەعـوەت کـرام کـە لـەوەدوا بـۆ رادیـۆ بنووسـم، لـەوێ زانییـان کـە لـە بـواری شیعریشـەوە توانەیەکـم هەیـە، دەتوانـم بڵێـم مـن لـە سـاڵانی نێـوان ١٩٦٩ تـا ئینقلابـی ئێـران ١٩٧٩، نـەوەت

لەسەدی گۆرانییەکان کە بۆ رادیۆی سنە تۆمار دەکران، شیعری من بوو. ئیتر بەو شێوەیە شرووعم کرد، دواتر خۆم نەقڵ کرد بۆ تەلەڤزیۆن بۆ بەشی فەرهەنگی مەردوم کە وابەستە بە تەلەڤزیۆنی تاران بوو، نزیکەی ١٨ ساڵ لە تاران بۆ فەرهەنگ و هونەر چالاکیگەلی فۆلکلۆری و کەلەپووری ئیشم کرد، دەتوانم بڵێم ٦٠-٧٠ لەسەدی حەکایەتە کۆنەکان، شیعر و بەستەی فولکلۆریی کوردی، ئەوەی کە مەربووت بە کوردستان بوو، ئاداب و سوننەت، بەتایبەت لە بواری نەورۆز و جەژنە کوردەوارییەکانەوە، من ئەنجامم داوە، ئەگەر کۆ بکرێنەوە نزیکەی شەش هەزار لاپەڕەی (موسەوەر)م ئامادە کردووە، تا ئێستەش هەر لە کتێوخانەی واحد فەعالیەتهای فەرهەنگیی تاران لەوێ پارێزراون.

**(پ): واتە ئەو ماوەیە لە تاران ژیان؟**

عەباسی کەمەندی: بەڵێ من ١٨ ساڵ لە تاران ژیام و کارم کرد، بەڵام زوو زوو بۆ ئیش دەهاتمەوە بۆ کوردستان، مەئمووریەتم وەردەگرت و دەچووم بۆ دێهاتەکان، دەچووم بۆ ناوچە (عەشایرییەکان)، لە هەرکوێ بکرایە کاری کۆکردنەوەی حەکایەتی فۆلکلۆری و شیعر و بەستە و ئادابی کوردیم دەکرد، ئەتوانم بڵێم زۆربەی ئەو کەسانەی کە لای خەڵک وەکوو قارەمان و پاڵەوان ناسران، وەکوو: سەنجەرخان، سەی ئەتا باینچیوی و... زۆر کەسانی دیکە، من حەکایەتی ژیانی ئەوانم

لــە ناوچــەی ژیانــی خۆیانــەوە کــۆ کــردەوە و زۆریــم بــە شــێوەی فیلمنامــە نووســی.

**(پ): باســی ئــەوەت کــرد کــە شــیعرەکانی بەشــێکی زۆر لــە گۆرانییــەکان لــەو ســاڵانە، لــە نووســینی ئێــوە بــوون، ئاخــۆ ئــەو گۆرانیبێــژە ناودارانــەی کــە شــیعرەکانی تۆیــان کــردووە بــە گۆرانــی کێــن؟**

عەباســی کەمەنــدی: ئەوەنــدەی ئێســتە لەیــادم بێــت (فەتانــەی وەلیــدی، وەلیــۆڵا موتەقــی، فەرەیــدوون ئــەردەڵان، هووشــەنگ شــگرف، حسێن شــەریفی، رەحیــم ســەڵەواتی، ئیســماعیل ســابووری کــە شــیعرێکم بــە نــاو «یــارەب» ئــەو کــردی بــە گۆرانــی)، دوایــی هەرچەنــد ئــەو لــە کرماشــان بــوو، بــەڵام شــیعرەکانی منــی وەرئەگــرت و لەســەر گۆرانیــی گۆرانیبێژانــی تــر ئەیخوێنــد، ئەلعــان حــوزوور زێهنــم نەمــاوە، بــەڵام زۆربــەی ئــەو کوردانــەی لــەو ســەردەمەدا گۆرانییــان ئەخوێنــد، لــە شــیعرەکانی مــن بەهرەیــان وەرئەگــرت.

**(پ): واتە لە هەژدە ساڵییەوە دانەبڕاوی لە ئیشی رادیۆ؟**

عەباســی کەمەنــدی: نەخێــر پێشــتریش باســم کــرد، کــە چوومــە تەلەڤزیــۆن بەناچــاری ئیشــی رادیــۆم بــەردا، بــەڵام لــە رادیــۆ زۆر راحەتتــر بــووم، لــە رادیــۆ تــۆ سەحنەســازییت نەبــوو، هەرچــی شــتە بــە دەنــگ ئەکــرا، مــن لــە تەلەڤزیۆنیــش چەندیــن زنجیــرە

دراماـم نووسـی و پەخـش و بـڵاو بـووەوە، وەکـوو: (میـر نـەورۆزی، پاڵــەوان پەمــە، ردپــای شــوغال، عشــق و...) زۆر کاری تریـش.

**(پ): لە بواری سینەمادا هیچ ئیشێکت هەیە؟**

عەباســی کەمەنــدی: چەنــد فیلمنامەیەکـم نووســی و نزیـک بـوو لــەوەی بگاتــە ئەنجـام، چونکــە قــەرار وابـوو بکـرێ، بــەڵام کاتــێ فیلمنامـە لـە ئێـران قـەرار بـێ تەسـویب بکـرێ، ٢٠ نەفـەر دەمـی بـۆ ئەکەنـەوە کـە دەیانـەوێ لێـی بخـۆن، منیـش بـە هەقیقـەت ئەوەمـە نەئەزانـی، بۆیـە هـەر کارەکەمیـان پـاش دەخسـت و بەهانەگیرییـان ئەکـرد، بۆیـە هیچـم پـێ نەکـرا، بـەڵام فیلمـی سینەماییم هـەر لـە پاڵــەوان پەمەکــەی خــۆم دەرهــاوردووە و لــە هەرزەکاریشــدا کارم بـووە لـەو بـوارەدا.

## وەرزەکان ئەمگۆڕن

**(پ): بۆچـی خـۆت لـە قـەرەی ئـەم هەمـوو بـوارە داوە، ئایـا خـۆت هەسـتت کـردووە لـە هەمـوو بوارەکانـدا توانـا و تاقەتـت هەیـە، یـان هەســتت کـردووە کەموکوورییــەک هەیـە لـەو بوارانــەدا، بۆیـە خـۆت لـێ داوە، بـۆ نموونـە، بـاس لـە رادیـۆ دەکەیـت، بـاس لـە شـیعر دەکەیـت، بـاس لـە چیرۆکنووسـین دەکەیـت، بـاس لـە نیگارکێشــی دەکـەی، بـاس لـە گۆرانــی و شـیعری**

**گۆرانی و ئاواز و هەموو ئەمانە، بۆچی ئەو هەموو بوارە؟**

عەباسی کەمەندی: وەڵامی ئەم پرسیارەت، بە نموونەیەک دەدەمەوە، بۆ نموونە کارخانەیەک ساز کراوە بۆ دروستکردنی سەیارە (ئۆتۆمبێل)، کاتێ کە سەیارەکە ئامادە ئەبێ، لە گۆشەیەکەوە ئەڵێن ئەم سەیارەیە توانای باربردنی ٧٠٠ کیلۆی هەیە، بەڵام لە راستیدا ئەو سەیارەیە ٢ تۆن بار دەکات، تێگەیشتی؟ ئەمە لە تەبیعەت و تاقەتی ئینسانیشدا هەیە، لای من قەت رووی نەداوە خۆم بڕۆم بە شوێن نیگارکێشیدا، یان دوای شیعرنووسین بکەوم، یاخود شوێن گۆرانی گوتن کەوم، بەڵکوو هەموویم لە وجوودما هەست پێ کردووە، ئەو هەستەم هەبووە کە من توانای ئەم کارەم هەیە و کردوومە و موەفەق بووگم. بۆ نموونە جەنابت کارێک دەکەیت، پێت ئەڵێن ئەم کارەت خراپە، ئەم کارەت نەکردا باشتر بوو، ئەمەت پێ ئەڵێن، ئەوە ئەداتە ناو زەوقتا و ناهێڵێ دووبارە بەو رێگایەدا بڕۆیت، بەڵام من بە درێژایی تەمەنی کارکردنم لەو بوارە جیاجیایانەدا، قەت یەک جاریش ئەم شتانەم پێ نەگوتراوە، هەر کارێکم کردووە ئافەرینی بەدوادا هاتووە.

**(پ): چۆن بەم هەموو بوارە رادەگەیت؟ بۆ نموونە کاتێک تۆ ماوەیەک دەست دەکەی بە شیعرنووسین، ئیتر واز لە ئیشەکانی تر دەهێنی، یاخود ئەم ئیشانە پێکەوە دەکەی، بۆ نموونە، دەتوانی لە ماوەیەکدا هەم ئیش لە**

**ئەلبوومێکی گۆرانیدا بکەیت و گۆرانی تۆمار بکەی و هەم خەریکی نیگارکێشی بی بە شەوەکەی یان بە رۆژەکەی، لە لایەکی دیکەوە خەریکی شیعر بیت، واتە تۆ ئەم ئیشانە پێکەوە دەکەیت، یان ماوە ماوە بۆ نموونە لە شیعر دوور دەکەویتەوە و دەچیتە نیگارکێشی، یا لە نیگارکێشی دوور دەکەویتەوە و ئیش لە گۆرانیدا دەکەی؟**

عەباسی کەمەندی: وەک گوتم، من قەد بە شوێن شیعرنووسیندا نارۆم، یانی کە من بڕۆمەوە ماڵەوە دانیشم و بڵێم ئەمشەو شیعرێک دەنووسم، نا وا نەبووە، شیعرەکە هاتووە بۆ من و زۆری بۆم هێناوە کە بچمە سەر کاغەز و شیعرەکە بنووسم. ئەوەش بڵێم کە هەر لەمێژەوە کار و تەشخیسی هونەریی من فەسڵی (وەرزی) بووە، یانی زستانان هەر بەفرەکە تێتە خوارەوە من تەواوی بەدەنم ئەبێ بە قەڵەم و فڵچە بۆ نیگارکێشان، ئەبێ بە پایز شیعرنووسینم پێ خۆشە، پایز زیاتر بە ئەدەبیات و شیعرەوە سەری خۆم گەرم ئەکەم، بەهار گۆرانیم پێ خۆشە، هاوین نووسینی چیرۆک و ئەو شتانەم پێ خۆشە، یانی ئاوایە فەسڵەکانە کە من ئەگۆڕێ، وەرزەکانە کە هەستی من ئەگۆڕێ بەرەو ئیشی تری تایبەت.

## ئەلبوومی داهاتووم لەگەڵ مۆزیکژەنانی یۆنانیدا دەبێ

**(پ): حاڵی حازر، ژیانی رۆژانەت چۆنە، چۆن کاتەکانت**

**دەگوزەرێنی، دەوامت لە کوێیە، بە رۆژ چی دەکەی، بە شەو چی دەکەی و خەریکی چ کارێکی هونەری یان ئەدەبیت؟**

عەباسی کەمەندی: من خانەنشین بووگم، یانی لە ماڵا دائەنیشم یا ئەنووسم یا نەقاشی ئەکەم، یا بە جۆرێ سەری خۆم گەرم ئەکەم. تەمەنی ئێستەم شەست ساڵ و سێ چوار مانگە، ئیتر نازانم چەنێکی تر بە دنیاوە دەبم، بەڵام بۆ داهاتوویێکی نزیک کارێکی موسیقا و گۆرانی (ئەلبوومێکی گۆرانی) رێک دەخەم و بەنیازم ئینشەڵا بە ئەنجامی بگەیێنم، وەلێ ئەم کارەم زۆر جیاواز دەبێ، چونکە لەگەڵ نەوازەندەگەلی یۆنانی کارەکە دەکەم، بۆ نیشاندانی ئەو لێکچوون و وێکچوونەی کە لەنێوان موسیقای یۆنانی و کوردیدا هەیە.

**(پ): مەبەستت ئەوەیە تێکستەکان کوردین، بەڵام مۆزیک و ئاوازەکان یۆنانین، یاخود ئەویش هی خۆتن؟**

عەباسی کەمەندی: ئاوازەکان هین خۆمە، شیعرەکان هین خۆمە، بەڵام ئێمەی کورد و یۆنانی شتهایەکمان هەیە موشتەرەکە، چونکە یۆنانییەکان ٩٤ ساڵ لە کوردستاندا ژیاون، زۆر شت بەناویانەوە ماوە لە کوردستان، زۆر شتمان هاوبەشە، بۆ نموونە هەڵپەرکێمان، زۆر ناوەکانی ناوچەی هەورامان یۆنانییە، من ئەو شتە هاوبەشانەم کێشاوەتە دەرەوە و لە موسیقای هەورامی کە سنخیەتێکی (وێکچوون)ێکی جوانی لەگەڵ موسیقای یۆنانیدا

هەیـە، بـەکارم هێنـاوە، لـەو بـاوەڕەدام ئەگـەر کاری تێـدا بکـرێ، ڕەنگـە شـتێکی مێژوویـی لـێ دەربچـێ.

**(پ): واتـە دەتوانیـن بڵێیـن ئەلبوومـی داهاتـووت، لەگـەڵ کۆمەڵێـک مۆزیکژەنـی یۆنانیـدا دەبـێ و تێکەڵەیەکـی بـا بڵێیـن مۆزیکـی کـوردی- یۆنانـی دەبـێ؟**

عەباسـی کەمەنـدی: بەڵـێ.. بەڵێ، تێکـەڵاو، یانی موسـیقاژەنەکانی ئەبـن بـە یۆنانـی و گۆرانییـەکان کوردین، ئینشـەڵا دوای ئەو پێشـانگە نیگارکێشـییەی کـە لـە هەرێمـی کوردسـتان لـە سـلێمانی دەیکەمـەوە بـە هاوکاریـی دامـودەزگای وەزارەتـی ڕۆشـنبیری لـە سـلێمانی، ئیـدی ئامـادەی ئـەو ئیشـە ئەبـم، چونکـە زۆر هەزینـە بـەردارە و خـەرجیـی زۆر دەوێ، لـە یۆنانیـش زۆر گرانییـە، ئەبـێ بـە جۆرێـک هەزینەکـەی بخەمـە ڕێ، ئنجـا دەسـت پـێ بکـەم.

**(پ): هەمـوو ئـەو گۆرانییانـەی کـە چڕیوتـن شـیعر و ئـاوازی خۆتـن، یـا هـی خەڵکـی تریشـی تێدایـە؟**

عەباسـی کەمەنـدی: هەمـوو گۆرانییـەکان هـی خۆمـن، بـەڵام زۆریانـم لـە موسـیقای فۆلکۆریـی کـوردی کێشـاوەتە دەرێ، هەندێکـی تـر سـوودم لـە ئـاوازی تریـش وەرگرتـووە، شـیعرەکانیش زۆربـەی هـی خۆمـن، یـان هـی شـاعیرەکان هەورامانـن، وەکـوو میـرزا شـەفیع پاوەیـی و میـرزا ئەولقـادر پاوەیـی، خانـا قوبـادی، وەلـی دێوانـە،

مەولـەوی (مەعدوومـی)، یـان فۆلکلـۆرە. هەنـدێ شـیعری شـاعیرانی تریشـم وەرگرتـووە، بـۆ نموونـە شـێخ رەزای تاڵەبانـی، ئیتـر ئـەوەی کـە بەدڵمـەوە نیشـتبێ، کردوومـە بـە گۆرانـی.

## کە لە گوتنی یەکەمین گۆرانی بوومەوە دوو کەس هاتنە ژێر باڵم

**(پ): یەکەمیـن گۆرانیـت کـەی بـوو، کام گۆرانـی بـوو، ساڵی چەنـد بـوو، کاتـی خـۆی کاسـێتێکت بـڵاو کـردەوە بەنـاوی (هەورامان)، ئاخـۆ پێـش ئـەوە کاسـێتی تـرت هەبـوو؟**

عەباسـی کەمەنـدی: پێـش (هەورامـان) سـێ کاسـێتی تـرم هەبـوو، ئەوانـەی کـە گۆرانیـی (سـەبریی گوڵفـرۆش)ی تێدابـوو، (بـی بـی خانـم) و نازانـم ئەوانـەت بیسـتووە یـا نـا؟

**(پ): بەڵـێ بەڵـێ هەموویانـم بیسـتوون و زۆر چێژیشـم لـێ وەرگرتـوون.**

عەبـاس کەمەنـد: تەنانـەت ئەوەڵیـن چیـرۆک کـە نووسـیم (شـەوبۆ و حەمەشـوان) لەنـاو کاسـێتێکدا تۆمـارم کـرد، بـەڵام ئەوەڵیـن گۆرانیـم گۆرانییـەک بـوو بـە نـاوی (هـای لـە کوێ؟)، ئـەو گۆرانییـە ئەوەنـدە تێیـدا ژیـام و ئەوەنـدە بـە هەسـت و روحـەوە گوتـم، کـە کاتـێ لـە سـتۆدیۆی تۆمارکـردن هاوردمیانـە دەرەوە، دوو

نەفـەر ژێـر باڵمیـان گرتبـوو، وەخـت بـوو لـە حـاڵ خـۆم بچـم، ئەوەنـدە هەیەجـان گرتبوومـی، چونکـە ئـەو کاتـە تەمەنـم زۆر لـە خـوارەوە بـوو، پێـم وابـێ تەمەنـم لەنێـوان هـەژدە تـا نـۆزدە سـاڵی بـوو، ئەڵبەتـە ئـەو زەمانـە نووسـەر و گۆرانیبێـژ و هونەرمەنـد هەمـوو ئەسـاڵەتیان هەبـوو، کەسـانێکی وەکـوو مەزهـەر خالقـی، حەسـەن زیـرەک، ماملـێ گۆرانییـان دەگوت، هەمـوو شـتێک دڵڕفێـن و دڵبزوێـن و جـوان بـوو. بەداخـەوە ئەمـڕۆ ئـەو هەسـتە نایابـە زۆر کەمـە، ئـەو رۆژگارە بـۆ ئێمـە، رۆژگارێکـی زۆر خـۆش بـوو، نازانـم ئەمـڕۆ هـەر وایـە یـا نـا؟

## پەیوەندیی من و شەهێن تاڵەبانی

**(پ): باسـی گۆرانیـی (سـەبریی گـوڵ فـرۆش)ت کـرد، کـە لەگـەڵ هونەرمەنـد خاتـوو شـەهێن تاڵەبانـی چڕیوتانـە و تـا ئێسـتا چێـژ و خۆشـیی خـۆی لەدەسـت نـەداوە و هەمیشـە نوێیـە، چیرۆکـی ئـەو گۆرانییـە چـۆن بـوو، چـۆن دروسـت بـوو؟ هەتـا ئێسـتا خەڵـک لـە زاری خۆتـەوە گوێـی لـێ نەبووە، چـۆن ئـەم شـەهێن تاڵەبانییـەت ناسـی و چـۆن پێکـەوە ئـەم گۆرانییەتـان گـوت؟**

عەباسـی کەمەنـدی: رەنگـە ئەمـە یەکەمیـن جـار بـێ لـە راگەیاندنـدا باسـی ئـەم نهێنییـە بکـەم، خـۆ ئەگـەر نەشـیکەم هـەر کـەس نەیدەزانـی، مـن گۆرانیـی (سـەبریی گوڵفـرۆش)م لەسـەر

گۆرانییەکی عەرەبیی ئەو زەمانەی هونەرمەندی عێراقی (داخل حەسەن) دروست کرد، کە گوێم لەو گۆرانییە بوو، بینیم زۆر جوانە و شیعری کوردیش دەخوا، بۆیە هاوردم ئاڵوگۆڕێکم تیا کرد و بوو بە (سەبریی گوڵفرۆش). سەرەتا قەرار وابوو بیدەم بە شەهێن تاڵەبانی بیخوێنێ، کاتێکی زۆر تەمرینمان کرد بۆ فێرکردنی، کە من شەهێنم فێری خوێندنی ئەو گۆرانییە ئەکرد، خودا عەفووی کا، مەرحووم گریشا میکایلزادە کە ئەو دەمە رەئیسی ئۆرکێسترای رادیۆی سنە بوو، گوتی ئەرێ کاکە بۆ بەیەکەوە ئەو گۆرانییە ناخوێنن؟ وتم: نازانم ئەوە ئیدی ئەبێ ئێوە تەسمیمی بۆ بگرن، وتی: من پێم خۆشە ئەمە بە یەکەوە بخوێنن، ئەوەبوو بەیەکەوە گۆرانییەکەمان گوت.

**(پ): خاتوو شەهێن تۆ هێنات بۆ رادیۆ و گۆرانی گوتن یان خۆی هاتبوو؟**

عەباسی کەمەندی: شەهێن من هێنام، چونکە براکەی رەفیقم بوو، پێشتر دەنگی شەهێنم بیستبوو لە زەماوەندێک، ئیدی وتم حەیفە تۆ بۆ لەم دەنگە بەهرە ناگری؟ ئەودەمە ئێمە لەگەڵ ماڵی شەهێن هاوسێ بووین و دایک و باوکیشی متمانەیان بە من هەبوو، ئەوەبوو چووم لە دایکی ئیجازەم وەرگرت و لەگەڵ خۆم بردم بۆ بە ئیسلاح رادیۆی ئەو زەمانە، ئیدی بە یەکەوە خوێندمان، هەر کە گۆرانییەکە بڵاو بووەوە، قسە و قسەلۆک و شایعات زۆر بوو، دەیانگوت کە ئەمانە (مەبەستیان من و

شـەهێن تاڵەبانـی بـوو) دوو کـوڕ و کچـی عێراقیـن و عاشـقی یەکتـر بـوون و نەیانهێشـتووە پێکـەوە هاوسـەرگیری بکـەن و هەڵاتـوون بـۆ ئێران، چووزانـم ئیتـر لـەم شـایعاتانە زۆر بـڵاوە بـوون. تەنانـەت ڕۆژێکیـان لـە مەجلیسـێکدا خـۆم دانیشـتبووم، بـەڵام ئەوانـەی قسـەیان ئەکـرد نەیاندەزانـی مـن خـۆم ئـەو گۆرانییـەم دروسـت کـردووە، دەیانگـوت ئـەو کـچ و کـوڕە عێراقیـن، جارێـک خـۆم خەریـک بـوو بـاوەڕم دەکـرد! چونکـە کابرایـەک گوتـی: ئـەو کـچ و کـوڕە پێـرێ شـەو هەردووکیـان لـە مەریـوان لـە مـاڵ مامـی مـن بـوون و مـن هەردووکیانـم دیـوە، منیـش بـە حەپەسـانەوە تەماشـای کابـرام ئەکـرد، نەمدەزانـی چـی بڵێـم!

**(پ): مـادام هەردووکتـان تـا ئێسـتە بەردەوامـن لـە هونـەردا، چۆنـە بیـرت نەکردووەتـەوە، کـە جارێکـی تـر پێکـەوە گۆرانـی بڵێـن، هیـچ شـتێکی وا قـەت بـاس نەکـراوە، لای خـۆت لای ئـەو، یـان لـە جێیەکـی تـر خەڵـک پێـی گوتبـن؟**

عەباسـی کەمەنـدی: ئیـدی شـەهێن دوای ئینقلابـی ئێـران چـوو بـۆ ئینگلیسـتان و مـن لـە سـنە مامـەوە، یەکتریمـان نەدیـەوە، مـن تەنیـا جارێـک کـە چـاوم پێـی کـەوت لـە کەناڵێکـی تەلەفزیۆنـی بینیـم موقابەلـەی دەکـرێ و باسـی مـن دەکات، ئەوەبـوو بـە تەلەفـۆن قسـەم لەگـەڵ کـرد، ئیـدی چـاوم بـە شـەهێن نەکەوتبـووەوە.

## ڕەسەنایەتی، نهێنیی هونەری منە

**(پ): خەڵکێک وای دەبینن، کە لەناو گۆرانیی کوردیدا کەم گۆرانی هەیە، وەک گۆرانییەکانی تۆ تەواو کوردی بن، واتە هەست ناکەی هیچ مۆرکێکی دیکەی پێوەیە، بۆ نموونە نە لە فارسی دەچن، نە لە عەرەبی دەچن، نە لە تورکی دەچن، نهێنیی ئەم تەواو کوردییە لەناو گۆرانییەکانتدا چییە؟**

عەباسی کەمەندی: ئەساڵەتگەرایی نهێنیی منە، من خۆم ئەگەر ببینم گۆرانییەک نەختێک تورکی، نەختێک عەرەبی تێدا خۆی نماییش دەکا، بەری لێ ئەگرم، ئەوە چونکە لەتمە یاخود زیان لە فەرهەنگی کۆنی پێشینانی من ئەدات، ناهێڵم تیایدا نەشونما بکا. ئیتر لازم نییە من بێم شەرحی بکەم، من لەم کارەمدا ئاوام کرد و ئاوا بووە، هونەرمەند یان گوێگر یاخود بینەر خۆی هەست دەکات، کە ئەم کارە کارێکی کوردییە و کارێکی ئەسیڵە و کارێکی دڵبزوێنە، چون موسیقای کورد لەنێو ژیانی کوردەوە هەڵدەقوڵێ، ژیانێک کە پڕ بووە لە مەشەقەت و تەنگانە و نارەوایی، وەکوو مۆسیقای هند و ئەفغان سۆزی تایبەتی خۆی هەیە. چون بە فەقر و بەدبەختی و نامولایمات و زوڵم و زۆرەوە ژیاوە، ئەوەیە کە ئەو هەستە، ئەو فەرهەنگە تیایدا خۆنمایی ئەکا و حاڵەتی دڵنشینیی پێ ئەدا.

**(پ): ئەوەنـدەی بیسـتوومە ئێـوە نزیـک بـوون لە مامۆسـتا حەسـەنی کامـکار باوکـی خوشـک و برایانـی کامـگار، کاری هاوبەشیشـتان هەبـووە، لەگـەڵ گرووپـی کامـگاران بـە هەمـان شـێوە، ئەمـە چۆن بـوو؟**

عەباسـی کەمەنـدی: راسـت ئەکـەی ٣ کاری ئاخـرم لەگـەڵ ئـەوان بـوو، بـەڵام لەگـەڵ باوکیـان مـن کاری زەبتکـراوم نەبـوو، لەگـەڵ باوکیـان چەنـد کاری کۆنسـێرتی زینـدووم هەبـوو، یانـی شـار بەشـار ئەچوایـن، مـن زینـدوو ئەمخوێنـد ئـەوان سـازیان لـێ ئـەدا، جـا بـەو شـێوە مـن لەگـەڵ مامۆسـتا حەسـەن کامـگار ئیشـم کـرد.

**(پ): واتە با بڵێین کۆنسێرتی زیندووتان ساز دەدا لەناو خەڵکدا؟**

عەباسـی کەمەنـدی: بەڵـێ بەڵـێ، کۆنسـێرتی هەفتـەی کوردسـتان بـوو لـە تـاران، ئیتـر منیـش لەگەڵیـان چـووم لـەوێ بەرنامەمـان ئیجـرا کـرد و دانەیـەک لـە گۆرانیبێـژەکان بـووم.

## بە ملیارەها دۆلاریش گۆرانییەکی تر لەگەڵ کامگاران ناڵێمەوە

**(پ): لەگـەڵ گرووپـی موزیکـی تریشـدا کارت کـردووە، جیاوازیـی کارەکانـت لەگـەڵ کامـکاران و لەگـەڵ موزیکژەنانـی تـر چـۆن بـووە؟**

عەباسی کەمەندی: وەڵا راستی بڵێم، موسیقا جایەگای هەست و ئیحساسی ئینسانە، زەمانێک پای پارە تێتە بەین و تەمەعکاری تێتە بەین و ئەمانە، شێوە ئەگۆڕێت، ئێتر پێوە دیارە. من زۆربەی کارەکانم کە ناوی نرا (کیژی کورد) و (کیژی لادێ) بوو لە ئەسڵا، ئەوەڵ موقەدەمات و شتەکانی خۆم سۆلفێژم کردووە، خۆم بە لالایی گوتوومە، پێم گوتوون ئەمە وا بژەنە و ئەمە وا لێ بدە.

پێوەند بە کارکردنم لەگەڵ کامکاران، هەست و ئیحساسی من و ئەرسەلان کامکار زۆر یەکی ئەگرت، ئەتوانم بڵێم وەکوو ئیشی لۆرێل و هاردی تەلەفزیۆن وابوو، ئەگەر یەکێکیان نەبێ، ئەوی تر نەختێک کز ئەبێ، بەڵام ئەو برا گەورەیانە کە حاڵەتێکی دۆنکیشۆت ئاسای هەیە، ئیدی بوو بە باعیسی ئەوەی کە من ئیدی بە شوێن ئەوانا نەڕۆم و دووریان لێ بگرم. بەڵام هەمیشە لە مێشکما بووە لەگەڵ گرووپێکی باشدا کار بکەم، چونکە بەڕاستی هیچ کام لەم کارانە، ئەوە نەبوو کە ئیشەکان بەباشی عەقڵم بیگرێ، هەرچەند هەندێکی لەناو خەڵکدا نیشتەجێ بوو و بە دڵی خەڵکەوە نیشت، بەڵام ئەیتوانی لەوە زۆر جوانتر بێ. بۆیە من هەمیشە بە شوێن کەسێکدا ئەگەڕێم کە لەگەڵما سنخیەتێک پەیدا بکا و پێکەوە ئیشێکی جوان بکەین، ئیتر دوای ئەوە بشمرم قەیناکە، من ئیدی ئەونەم پێوە نەماوە و زۆریش عەلاقەمەند بە ژیان نیم، بەڵام بە حەیفی ئەزانم ئەوەی لە دەروونمدا ئەجۆشێت، لەگەڵ خۆم بیبەمە ژێر قەبر.

**(پ): واتـه دەتـەوێ بڵێـی تـۆ جارێکـی تـر ئیـش لەگـەڵ کامـگاران ناکەیتـەوە، یـا رەنگـە رێـک بکـەوێ پێکـەوە ئیـش بکەنـەوە؟**

عەباسـی کەمەنـدی: بـەوەڵا کاکـە ئەوەنـدە تاسـەی دوو سـێ نەفـەری ئـەو کوڕانـەم کـردووە بـە دڵ و بـە دەروون حـەز ئەکـەم جارێکـی تـر، پێکـەوە دانیشـین قسـە بکەیـن، بـەڵام ئەگـەر پـای میلیاردەهـا دۆلار بێتـە بەیـن، مـن ئیـدی لەتـەک ئەوانـدا دەرناکەومـەوە بـۆ گۆرانـی گوتـن.

**(پ): جەنابـت یەکێکـی لـەو گۆرانیبێژانـەی کـە لـە کوردسـتانی باشـوور (هەرێمـی کوردسـتان- عێـراق) جەمـاوەرت یەکجـار زۆرە، لـە هـەردوو نـەوە جەمـاوەرت هەیـە، ئەوانـە حـەز دەکـەن زوو زوو ئەلبوومـی گۆرانیـی تـازەت بکەوێتـە بەردەسـتیان، بـەڵام هەسـت ئەکـەم ئەلبوومەکانـت کەمـن وەکـوو ژمـارە، ئایـا بـۆ خـۆت بەحـەزەری، دەتـەوێ کـەم بـن و زۆر و بـۆر نەبـن، یاخـود توانـای دارایـی، یـان هۆکارەکـە نەبوونـی گرووپـی مۆزیکـی باشـە؟**

عەباسـی کەمەنـدی: ئەوەڵـەن بـۆ مـن نابـێ بـڕۆم هـەر منداڵـێ کـە سـازی لـێ دا، بڵێـم فەرمـوو تـۆ لەگـەڵ مـن مۆزیـک بژەنـە، ئـەوە ناکـرێ، مـن ئەبـێ لەگـەڵ کەسـانێکدا کار بکـەم، نـاودار بـن، تەوانمەنـد بـن، قـەوی بـن، تـا قودرەتـی کارەکـەی منیـش هەسـتی پـێ بکـرێ. ئەوەیشـە لـەڕووی خەرجیـی کارەوە زۆر گرانـە،

مەسەڵەن پارە بۆ هەر یەک سەعات ٦٠ هەزار تمەن هەقی ئیستۆدیۆ لە تاران دابین کرابوو، بۆ ئیشی موسیقا یا هەر کارێکی تیا بیکەی، بەڵام ئەمساڵ بووە بە ١٠٠ هەزار تمەن، رۆژ بەرۆژ ئەم قیمەتانە ئەچێتە بان، ئیتر جیا لە موسیقژەن، تەنزیم و یا نازر زەبت، کە زۆر گران دەرتێ، بەڵام ئەگەر لەودیو (مەبەستی کوردستانی باشوورە) کۆمپانیایەک بێ و بڵێ تۆ ئەم ئیشە بۆ من ئەنجام بدە، من ئەتوانم ئەونە پارە بە تۆ بدەم، من بە دەستێکی بازترەوە ئیشەکەم ئەکەم، ئەگەر حەتا بچوایمە ژێر قەرزیش ئەمگوت قەیناکا، من لە کاتی خۆیا ئەم پارە تێرمەوە ئەیدەم بە خەڵکەکە. بەڵام موشتەری نەبووە، ئەڵێن گۆرانی بخوێنە، ئەڵێن بیکە، بەڵام لە کوێ و بیدەم بە کام کۆمپانیا؟ ئەوە بۆم ناموشەخەس بووە، ئایا ئەو خەرجییەی دەیکەم لەو کارەدا دێتەوە دەستم یان نا؟ دڵهوڕەی ئەوە نەیهێشتووە من پێشرەوی بکەم.

## چیی بە عادل هەورامی گوت؟!

**(پ): دەربارەی هونەرمەندانی کوردستانی عێراق، پێوەندیت لەگەڵ کامیان باشە، دەنگی کامیانت پێ باشە؟**

عەباسی کەمەندی: نەسڵی پێشوو وەک کەریم کابان، قادر کابان، عوسمان عەلی... ئەو نەسڵە کە هاودەوری خۆم بوون، هەموویانم بەدڵ بوون. هەموویان جوان کاریان ئەکرد، نەسڵی

زووتـر وەكـوو تاهيـر توفيـق وەكـوو عەلـى مـەردان، ئەمانـە ئيتـر تيكـرارەوە نابـن، بـەڵام دواى ئـەوان كەسـێک رەنـگ و بـۆى ئەوانـى پێـوە بـێ مـن نەمـدى. ئيسـتەش لاوى دەنگخۆشـى زۆرە، ئەوانـە مـن زۆرى پـێ موعجيبـم، عـادل هەوراميیـە، دەنگێكـى زۆر ئەسـيلى بـۆ گۆرانيـى هەورامـى هەيـە. جارێـک هـات لـە منـى پرسـى وتـى: چـى بكـەم؟ وتـم: كاكـە جگـە لـە هەورامـى بـە شـێوەزوانى تـر مەخوێنـە، تـۆ سـۆرانى ناتوانـى ئـەو جـۆرە ئەشـێ دەربێنـى، بـەڵام دەنگـت دەنگـى موسـيقاى هەوراميیـە حەيفـە. وەڵا بـە قەوڵيشـمى كـرد تـا ئـەو جێگـە ئەزانـم هـەر خەريكـى گۆرانيـى هەوراميیـە، كوردسـتانى ئەوديو دەنگخۆشـى زۆرە، بەڵام گۆرانيبێژى كەمە، چونكە شـناختيان كەمـە، كـەس نييـە يارمەتييـان بـات بـە شـوێن ئيسـالەتى خۆيانـەوە بـن. گۆرانـى ئەگـەر ئێسـالەتى كوردايەتيـى پێـوە بـێ، هـەم عومـرى زياتـر ئەبـێ لەنـاو خەڵكـدا و هـەم شەخسـيەتى زۆرتـرە.

## كەلەپوورى كورد زۆر دەوڵەمەندە

**(پ): هەسـت دەكـەى هونـەرى گۆرانـى و مۆزيكـى كـوردى لـە سـايەى ئـەم ئازادييـەى كـە لـە كوردسـتانى عێـراق هەيـە، هيـچ گەشـەكردنێكى پێـوە ديـارە، ئەگـەر هەيـە، ئاخـۆ هـى ئەوەيـە سـبەى رۆژ شـانازيى پێـوە بكەيـن؟ حـەز دەكـەم لـە زارى بەڕێزتـەوە بيزانـم، هونـەرى گۆرانـى و مۆزيكـى كـوردى لـە كوردسـتانى باشـوور، چووەتـە پێـش، يـان لـە ئاسـتى خـۆى**

وەستاوە، یاخۆ پاشکەوتووین و بەرەوە شێواندن دەچین؟

عەباسی کەمەندی: کورد ئەوەندە لە بواری فەرهەنگییەوە دەوڵەمەندە، ئەوەندەی هەیە کە دەتوانێ بۆ سەد ساڵی داهاتوو، بێ ئەوەی لە بێگانەیەک بەهرە وەربگرێ، خۆی لە چەندین بواری هونەریدا نیشان بدا. کورد حەکایەتی زۆرە، کورد داستانی زۆرە، تۆ تەماشاکە دوو نەفەر بە ناوەکانی گوبایاشی و ئەوی ترم لە یاد نییە لە چین و ژاپۆن، هاتن حەکایەتە کۆنەکانی ژاپۆن و چین کە چەند دانەیەکیشی لە کوردستانەوە چووە، یا با بڵێین لە جادەی ئەبریشەمەوە چووە، ئەمانەیانە کردە فیلم بۆ سینەما و داستان و مێژوو و هونەری ئەدەبیاتی چین و ژاپۆنیان بە دنیا ناساند، حەتا وەرزشە نمایشییەکانی خۆیانیان بە جیهانی کرد. بەڵام ئێمەی کورد هەرچەندە دابەش کراوین تووشی کێشەگەلی زۆر بووین، ئەتوانین هەر بە داستان و حەکایەتەکانی خۆمان،ساڵهای ساڵ سینەمای پێ پەرە پێ بدەین، موسیقای پێ پەرە بدەین، بەڵام شناختی گەرەکە، هەڵبەت بە تەنیا شناختی ئەکادیمی بەس نییە، دڵنیام من ئەوە ئەڵێم کە ئیشەڵا لە داهاتوودا، کوردستان ئەبێتە خاوەن شتهایەک کە لە توول تاریخا شانازیی پێوە بکا لەسەر ئاستی دنیا و ناوچەکەش.

**(پ): دێمە سەر شیعرەکانت، هیچ دیوانی شیعرت چاپ کردووە؟**

عەباسی کەمەندی: دوو دیوانی شیعریی ئامادەم هەیە بۆ چاپ، یەکیان بە کوردی و ئەوی تر بە فارسی، بەڵام تا ئێستە مۆڵەتی چاپکردنیان پێ نەداوم، هەردووکیشم بۆ تۆ ناردووە. (دوای ئەم دیمانەیە دیوانە کوردییەکەی چاپ کرا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان- بەرهەم عەلی)

**(باس) من بەختی ئەوەم هەبووە، بەشێکی باش لە دیوانەکەتم خوێندووەتەوە، لەویش دیسان لەو باوەڕەدام هەست و زمانێکی تەواو کوردانەی بێ ڕتووش و غەل و غەش هەیە، شێوەزارێکی تایبەتە، لە بەینی هەورامی و سۆرانی و هی تریش، ئەمەیان چۆن؟**

عەباسی کەمەندی: لە شیعردا ئەگەر دابمێنم بۆ وەزن و قافیە و ڕەدیف، لە هەورامی بەهرە وەرئەگرم، لە سۆرانی بەهرە وەرئەگرم، زاراوەی سنەیی بۆ شیعر نووسین جوان نییە. شاعیرانی کۆنی کورد خەڵکی سنەش بووگن هەر بە شێوەزوانی ئەردەڵانی شیعریان گوتووە یانی نیوە هەورامی، شیعرەکانی منیش ئەو ڕەنگ و بۆنەیان هەیە.

**(پ): ئەو توێژینەوانە یان ئەو ڕیپۆرتاژە مەیدانییانەی بەدرێژایی نزیکەی بیست ساڵێک لە بابەتی ئەدەبی و هونەری و فۆلکلۆری و کەلەپووریی کوردی، بۆ دەزگای دەنگ و**

**ڕەنگی کۆماری ئیسلامیی ئێران لە تاران ئەنجامت دا، ئەو ئەرشیفەت چی لێ هات، ماوە؟**

عەباسی کەمەندی: ئەو ئارشیوە ماوە، ها لە کتێوخانەی «فەرهەنگ مەردوم» پارێزراوە، بەڵام بیستم کاورایەک، گوایا نەوەی میرزا شەفیع پاوەیی بووە، داوای ئەو ئەرشیفەی لێ کردوون کە کاتی خۆی من لەبارەی میرزا شەفیعەوە بۆ ئەو دەزگایەم ئامادە کرد، داوای لێ کردوون بیدەنێ تا وەک کتێبێک چاپی بکات، بەڵام نەیانداوەتێ و پێیان گوتووە ئەمە ئەموالی دەوڵەتییە و ئەبێت قیمەتی بۆ دابنرێت، ئیتر نازانم لە داهاتووا چی بۆ دەکەن.

**(پ): ئەی خۆت بیرت نەکردووەتەوە بیکەیتە کتێب و چاپی بکەیتەوە؟**

عەباسی کەمەندی: بەداخەوە ئەو سەردەمە من هەر کارێکم ئەکرد، تەحویلی ئیدارەم ئەدا، ئیمکانی ماڵییم نەبوو کە نوسخەیەکیشی لێ بۆ خۆم دابنێم.

## تابلۆی حەمامی ژنان

**(باس): با کەمێکیش بێینە سەر بواری نیگارکێشی و نەقاشی، لەوێدا لە کام ڕێبازی هونەریدا خۆت دەبینییەوە؟**

عەباسی کەمەندی: ئەگەر هەستم کردبێ نیازم بە نیگارکێشانە، هەموو کارەکانم بۆ تەعتیل کردووە و نیشتوومەتە پای نەقاشی. ئەویشە کە من زۆربەی مەکتەبەکان (رێبازە هونەرییەکان) دەناسم، کە ناچرالیزم چییە، ریالیزم چییە، کووبیزم چییە، ئەبستراکت چییە؟ بەڵام حەزم نەکردووە جگە لە هەستی خۆم کە هەستێکی ریالیسمە، ئیشی تر بکەم. ئەوانەی کێشاومە هەست و ئیحساسی خۆم بووە، مەسەڵەن من بۆت بڵێم لە تەمەنی زۆر منداڵیدا، من لەنێو حەمام ژنانە (لەگەڵ دایکما ئەچووم بۆ حەمام ژنانە) لەناو حەمام ئاشقی کچێکی هاوقەد و قامەتی خۆم بووم، من ئەو حەمام ژنانەمە بە تابلۆ کێشاوە، خۆم و ئەو کچیشمە تیا کێشاوە. یانی ئەوەی کە من ئەیکێشم موشاهێداتی خۆم بووە، ئەوەی کە لە دڵ و لە دەروونما بووە. یا سەردەمێک ئەچوومە دێهاتەکان، ژنم ئەدی لەنێو لاس و لەنێو تەپاڵەپێچان، مناڵەکەی بەستووەتە سەر کۆڵی و خەریکی لاس پێژاننە، ئەوەمە ئەکرد بە تابلۆ، یانی هەموو نیگارەکانم کوردەواری و کوردیین و شتی تری تیا بەدی ناکرێ.

**(باس): ئەو تابلۆیەت کە دارێکی وشکە و لەبری میوە و بەرهەمی تر، مەمکەوشکەی منداڵانی گرتووە، وتت ناوم ناوە (دارە ئەنفال)، دەمەوێ بۆم باس بکەیت، کەی و چۆن بڕیار دەدەی لەسەر کارەساتێکی کورد تابلۆیەک بکێشیت؟**

عەباسی کەمەندی: من لە تەلەڤزیون تەماشام کرد،

ریپۆرتاژێـک بـوو، کۆمەڵـە کەسـێک، خەریـک بـوون خاکیـان هەڵئەکەنـد بۆ ئـەو جێگایانـەی کـە ئەنفالـی تێدا کرابوو واتـە گۆڕە بەکۆمەڵـەکان. کاورا قوڵنگەکـەی وەشـان، یـەک دانـە مەمکەمـژە لـە تـەک تاکێـک پێـڵاو کەوتـە دەرەوە، منیـش ئـەو دیمەنـەم لـە تەلەڤزیۆنـدا بینـی، جـا ئەگـەر ئـەو دەوڵەتانـەی کـە زوڵـم ئەکـەن، ئـەو ڕژێمانـەی وەکـوو سـەدام حسـێنی ناجوامێـر کـە گەرەکییـە بـەزۆر میلەتێـک بفەوتێنـێ، ئەگـەر بزانـێ ئـەم جـۆرە کارانـە، وەکـوو ئەنفالکـردن وەکـوو کیمیابارانـی هەڵەبجـە، لـە سـەردەمێکا جەماعەتێـک لەبەیـن ئـەوەن، داخ ئەنێتـە بـان دڵ جەماعەتێکـەوە، بـەڵام لـە مێـژوودا ئـەم تاوانـە ئەمێنیتـەوە و ئەبـێ بـە مێـژوو بـۆ ئـەو خەڵکـە، مـن ئـەو دارە کـە لـە جێـی میـوە مەمکەمـژەی پێـوە سـەوز بـووە، دارێکـە کـە نەسـڵهای (نەوەکانـی) داهاتـوو و هـەزاران هـەزار منداڵـی کـورد لەپایـا ئەژیـن و لـەو مەمکەمژانـە تێـر ئەخـۆن و گـەورە ئەبـن و ئەبـن بـە بەرگریـکار لـە ژیانـی خۆیـان و وڵاتیـان، داری ئەنفـاڵ دارێکـە کـە جەوانانـی کـوردی پـێ گـەورە ئەبـن.

**(پ): تابلۆیەکـی تـرت هەیـە، کۆمەڵێـک مێروولـە بـە جۆرەهـا چـەک و دووربیـن پاسـەوانیی سـێوێک دەکـەن، بـەڵام سـێوەکە لەنـاوەوە کـرم تێـی داوە، مەبەسـتت لـەم تابلۆیـە چییـە؟**

عەباسـی کەمەنـدی: مەبەسـت لـەو تابلۆیـە ئەوەیـە کـە تـۆ ئەگـەر دوژمنـی خەیاڵـی بـۆ خـۆت داتاشـی و هـەر چـاوت بـە دوورەوە بـێ، کـە دوژمـن لـەم کێـوەوە و هێرشـت بـۆ دێنـێ و دێتـە

ئـەم دیـوا. بیـرت لـە ئەسـڵی کارەکـەت ئەبـڕێ و کێشـەکانی نـاو وڵاتـی خـۆت وەک ئـەو سـێوەی مێروولـەکان پشـتیان تـێ کـردووە، فەرامـۆش ئەکەیـت، ئـەو لەنـاوەوە کـرم تیـێ ئـەدا و داغانـی ئـەکا. ماوەیـەک بیسـتم بەرپرسـێک لـە هەرێمـی کوردسـتان، پارەیەکـی زۆری بـردووە و هەڵاتـووە، حەیفـە لـە کوردسـتان ئـەم جـۆررە شـتانە هەبـێ، نابـێ ئاوهـا مامەڵـە لەگـەڵ وڵاتـی خۆتـدا بکەیـت، کوردسـتان لـە سـایەی ئازادیـدا دەبـێ لـە هەمـوو رووێکـەوە پێـش کـەوێ، تەنانـەت لـە بیرکردنـەوەی مرۆڤەکانیشـیدا.

## فەرهەنگی زەردەشتی

**(پ): جارێـک لـە دیدارێکـدا باسـی کولتـوور و فەرهەنگـی ئایینـی زەردەشـتت کـرد، ئایـا بـۆ کـورد گرنگـە بـۆ نەسـڵی (نـەوە)ی ئێسـتە و بـۆ نەسـڵی داهاتـوو لـە فەرهەنـگ و کولتـووری زەردەشـتی تـێ بـگات، یـان لەنێـو کولتوورەکەیـدا ئـەو لاپـەڕە بزربووانـە زینـدوو بکاتـەوە، یـان لانـی کـەم ئـەو مێـژووە دزراو و زەوتکـراوە بکاتـەوە بـە هـی خـۆی؟**

عەباسـی کەمەنـدی: ئێمـە هـەزاران سـاڵ ئـەو فەرهەنگەمـان بـووە و هەڵگـری ئـەو کولتـوورە بوویـن، بـەڵام ئـەو کولتـوورە ئەگـەر قودرەتـی بوایـە دیفاعـی لـە خـۆی ئەکـرد، وەکـوو مەسـیحیەت، نەوەکـوو رامالـرێ، ئـەوە ئیـدی چـووە و ئیـدی باسـکردنی بـێ خـودە، بـەڵام شـتهایەکی تیـا مـاوە وەکـوو فەرهەنـگ وەکـوو

ئاداب و سوننەت. ئەوەم لە کۆمەڵە وتارێکدا نووسیوە بەناوی «تاریخ بی تکلف» یانی زۆر لەسەری چووگم کە پیرشالیار کێیە، زەمانی زەرتوشت چۆن بووە، چی قەوماوە، چی کراوە؟ ئەوانەم تیا نووسیوە، نیشانیهایەک ئەوەی لە کوردستان بەدەست دیگەران نەکەوتووە، من بەدەستم هێناوە و لە کتێبی «تاریخ بی تکلف»دا نووسیومە، ناشرێکیش (خاوەن دەزگایەکی چاپ) بردوویەتی بەناوی ئاغای کەرباسی کە ئەگەر ئیرشاد (وەزارەتی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی) موجەویزی (مۆڵەتی چاپکردن)ی پێ بدەن، چاپ ئەکرێت و دێتە دەرەوە. بەڵام بە فارسییە بە کوردی نییە، مەگەر کەسێک بیکاتە کوردی.

(پ): تا ئێستە چەند کتێبی چاپکراوت هەیە؟

عەباسی کەمەندی: چەند کتێبێکم هەیە چاپ کراون، یەکێکی مێژووی پاڵەوانێکی کوردە و بەناوی (سرگزشت ورزش باستانی کردستان) کە سی ساڵ لەمەوبەر هاتووەتە بازاڕەوە، هەروەها ژیاننامە سەی عەلی ئەسغەر لە جزوەیەکا، وەک (نامیلکە) نووسیومە،...هتد. بەڵام فیلمنامەی زۆرم نووسیوە کە زۆری بووەتە فیلم و زۆری ماوە، با بزانم ئیشەڵا ڕێگەم بۆ باز بێ و تەمەن ئیجازە با، بیانسپێرم بەودیو کە چی لێ ئەکەن. (ماوەیەک دوای ئەم دیمانەیە، کەمەندی ٣٦ فیلمنامەی حەکایەتی کۆنی کوردەواریی بۆ ناردم و لە هەفتەنامەی (باس)دا بڵاوم کردنەوە و لەگەڵ ئەم کتێبەدا ئەوانیشم لە کتێبێکدا بەناونیشانی

## موزیکی کوردی یارسان

**(پ): لەنێو کوردستانی رۆژهەلات، بەتایبەت لە کرماشان و نێو یارسانەکان، کولتووری کورد و مەقامەکانی یارسان زۆر باش پارێزراون، پێموایێ هیچ ناوچەیەکی ولاتی کوردەواری وەکوو ئەوان مەقام و میراتە کولتوورییەکانی خۆیان نەپاراستووە، ئاخۆ لای ئێوە هیچ هەولێک هەیە لەگەڵ هونەرمەندان و گرووپە مۆزیکژەنەکانی یارسان، شتێکی کوردی پێشکەش بکەن؟**

عەباسی کەمەندی: ئەوان موسیقای یارسانی موسیقای سرووت و خانەقا و جەمخانەکانی خۆیانە ئیشی لەسەر دەکەن و دەیژەنن و دەیچڕن، تێ گەیشتی؟ بەڵێ، ئەوانە لەگەڵ ئەم نەوعە موسیقییە کە من کاری تێدا دەکەم زۆر جیاوازە. ئەوە کاری تەکیە و بارەگا و ئەو شتانەیە، ئەویش موسیقای خۆیانە و مەربووت بە خۆیانە.

**(پ): کە گوێ لە گۆرانییەکانت دەگرین، هەست دەکەین تۆ ئینسانێکی عاشق بوویت، مرۆڤێک بوویت خۆشەویستیت کردووە، بۆ نموونە من زۆر بەوردی گوێم لە گۆرانیی**

**(کیــژی لادێ) گرتــووە، شــتێکی زۆر تایبەتــە، حەســرەت و دووری لــە کچێکــی لادێیــی هێنــدە بەجوانــی بــاس دەکەیــت، دەڵێــی چیرۆکێکــی راســتەقینەی لەپشــتەوەیە، ئاخــۆ عەباســی کەمەنــدی لــە ژیانیــدا دڵداریــی کــردووە؟ عاشــق بــووە؟ ئاخــۆ ئــەو کەســەی خۆشتویســتووە، پێــی گەیشــتی یــان عەشــقی ناکامــی لــێ دەرچــوو؟ (بێگومــان ئــازادی لــەوەی هیــچ وەڵامێکــی ئــەم پرســیارە نەدەیتــەوە).**

عەباسی کەمەندی: پێشتریش پێم گوتی، من هەر لە منداڵییەوە لەناو حەمام ژنانا عاشقی کچێکی هاوتەمەنی خۆم بووم، نازانم ئەودەم تەمەنم ٥ ساڵ بوو یان ٦ ساڵ، نازانم. عیشق شتێکە کە ئەگەر لە وجوودی ئینسانی دەربهێنی هیچی نامێنێ، بەڵێ منیش وەکوو هەموو ئینسانێک عاشق بووگم، منیش دڵداریم کردووە، بەڵام بەداخەوە دەستی کەسانی تر بووە باعیسی فەوتانی ئەو عیشقە. لە گۆرانیی (نەتۆرێیا) ئەڵێم: «گوێ مەگرە لە تانە و تەشەری خێڵی بەخێڵان ...رۆژێک نییە کە سەد لانە لە لا نەشێوێنن»، ئەو شتانە بووە و بوونەتە باعیسی دووری و زۆر گرفت بۆ من. ئیتر عێشق و عاشقی بۆ من شتێکی ناجۆرە و شتێکی نارەوایە، بەڵام منیش پێشتر عەشقم هەبووە، وەکوو ئەم هەموو ئینسانە.

## بۆچی گۆشەگیری؟

**(پ): هەمیشە کە باس لە ژیانی کۆمەڵایەتیی عەباسی کەمەندی دەکرێت، ئاماژە بە خاڵێک دەدرێ، ئەویش (گۆشەگیرییە)، واتە پێوەندیی کۆمەڵایەتیت کزە، ئایا بەڕاستی تۆ حەز بە گۆشەگیری دەکەیت؟ ئەگەر وایە بۆچی؟ ئایا دەتەوێ ئیش بکەی و کەس سەرقاڵت نەکا؟ یاخود لە خەڵک نیگەرانی؟ ئەمە لە چییەوە سەری هەڵداوە؟**

عەباسی کەمەندی: پەندێکی فارسی هەیە دەڵێ: "با مردم این روزگار سلامی و والسلام»، واتە (لەگەڵ خەڵکی ئەم زەمانە سڵاوێک و وەلسەلام)، ئیتر هیچ. یانی چۆن بڵێم، من زۆر لەتمەم دیوە، زۆر لە هاورێیەتی لەگەڵ بازێ ئینسانا لەتمەم دیوە و بەم نەتیجەیە گەیشتم کە تەنیا سڵاوێک و وەلسەلام. کارم بەسەر کەسەوە نییە، کاری خۆم ئەکەم ئیشی خۆم ئەکەم، زۆر خۆم ناخەمە بەرچاو، چوورزانم جەماعەتێک هەن بوخڵن و حەسەدیان هەیە، پێیان خۆشە تۆ بشکێنن، پێیان خۆشە تۆ نابووت بکەن، منیش رێگەیان پێ نادەم، ئەو شتانە بووگە و منیش زەرەر و زیانی زۆرم لەو پەیوەندییانە دیوە، لەبەر ئەوەیە کە تەنیابوونم پێ خۆشترە، ئەوەی کە کارم بەسەر کاری کەسەوە نەبێ، بۆ خۆم بژیم، دەخاڵەتم نەبێ لە ژیانی کەسدا و حەتا کاتێ لێشم پرسیار ئەکەن، جۆرێک جواو ئەدەمەوە کە نە شیش بسووتێ

و نـه کەبـاب. کارم بەسـەر کار کەسـەوە نییـە و پێشـم خـۆش نییـە کـەس کاری بەسـەر کار منـەوە بێـت.

## تەنیا ئەوەندەم ژین دەوێ

**(پ): لـەم تەمەنـەی ئێستاتدا کـە ٦٠ سـاڵ و چەنـد مانگێکـە، چۆن دەڕوانیتـە ژیـان، یاخـود چۆن بیـر لـە مـەرگ دەکەیتـەوە؟ ئایا پێـت خۆشـە سـاڵانێکی زۆرتـر باشـتر بژیـت، تـا ئـەو پرۆژانـەی هەتـە، بیانهێنیتـە وجـوود؟**

عەباسـی کەمەنـدی: بـاوەڕم پـێ بکـە، ئەگـەر زەڕەیەکیـش دڵبەسـتەگیم بـە ژیـان هەبـێ بـە بۆنـەی ئـەوەوە هـەس کـە بتوانـم کارەکانـم تـەواو بکـەم. ئەگینـا مـردن شـتێکی خـراپ نییـە، وەک یەک لـە زانـا گـەورەکان گوتویەتـی: (ئەگـەر ئینسـان مەرگـی بناسـیایە بیزانیایـە کـە مەرگـی چ لەزەتێکـی هەیـە، تەنـی بـە ژیانـی نەئـەدا واتـە ئامـادە نەدەبـوو بـژی). مـردن شـتێک نییـە لێـی بترسـیت، مـن شـیعرم هەیـە لەمبارەیـەوە، لـە مـەرگ هیـچ ترسـێکم نییـە. بـەڵام حەزیـش ناکـەم کـە ئەگـەر نەمـردم خـۆم بکـوژم، نـا شـتی وام حـەز لـێ نییـە، بـەڵام پێـم خۆشـە بەرلـەوەی بمـرم، ببینـم کـە ئەوەڵـەن منداڵەکانـم هـەرکام چوونەتـە سـەر ژیانـی خۆیـان و موشـکیلیان نییـە و ناڕەحەتییەکییـان نییـە، دوای ئـەوە ببینـم کـە خەڵکەکـەش بـە ئـازادی گەیشـتوون، بـە راحەتـی گەیشـتوون و موشـکیلێکیان نییـە. ئـەوە ئیتـر مەرگێکـی ئارەزوومەندانـە و خۆشـهاتنی پـێ ئەڵێـم و

هیچ ترس و خۆفێکم نییە لێی. بەڵام هەر وەک گوتم پێم خۆشە بەر لە مردن، ئیدی هیچ کارێ نەماوێ کە ئەفسووس بخۆم و بڵێم: بۆ ئەم کارە نەکرا؟ بۆ ئەم ئیشە نەکرا؟ تەنها ئەو رادەیە ژیانم دەوێ و ئیدی هیچ تەمایەکم نییە.

**(پ): دێمە سەر زێدی خۆت، شاری سنە، ئاخۆ ئەم شارە بۆ عەباسی کەمەندی چی دەگەیەنێ؟**

عەباسی کەمەندی: سنە، شاری تێپەڕبوونی ژیانی منە، شاری عیشقی منە، شارێکە کە تیای عاشق بووگم، شارێکە کە باوکم تیای عاشق بووە، دایکم تیای ژیاوە، شاری سنە تەنیا شارێکە بۆ من کە لە هەر کوێیەکی دنیا بوو بێتم، دوای دە رۆژ پانزە رۆژ، وای لێ کردووم بگەڕێمەوە بۆ لای، ئەگەرچی هیچ خێر و خۆشییەکم تیا نەدیوە، بەڵام تەنیا ئەوە بڵێم کە زادگەی خۆم و باوک و باوەگەورەمە و پێم خۆشە هەر لە سنەشدا بمرم.

**(پ): کە باس لە شاری سنە دەکرێ، کۆمەڵێ ناوی گەورەی بواری هونەر و ئەدەب و رۆشنبیریمان دێتەوە یاد، ئەوانە هەمووی خەڵکی سنە بوون، هەمیشە پێی دەڵێن شاری هونەرمەندان و رۆشنبیران و دەنگخۆشەکان، ئایا نهێنییەک هەیە لەمەدا یاخود رێکەوتە، یان ژیان لە سنە رۆڵی هەیە لەوەی رۆشنبیر و هونەرمەند و زەوق و سەلیقەی**

## جوان پێ بگەیەنێ؟

عەباسی کەمەندی: ئەوەی کە ئەڵێن سنە چوارسەد ساڵ عومریەتی و میرزا سلێمان خانی ئەردەلان هات و سنەی بینات نا، دەڵێن گوایە بەر لەوە سنە نەبووە، ئەمە وا نییە، من زۆر لە مێژووەکەی ورد بوومەتەوە زۆرم کار لەسەر کردووە، سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر مادەکان هاتوونەتە سنە، شاری «تووش نەوزەر»ەی یەکێ لە شازادەکانی مادە، ٢٥٠٠ ساڵ ئاوایی زەڕین کەوشان بووە. دواتر سلێمان خانی ئەردەلان پاش ئەوەی کە لە لایەن عوسمانییەکانەوە بەتەنگ هات، لە حەسەن ئاواوە کۆچی کرد بەرەو سنە و لەسەر قەڵا کۆنی سنە، دووبارە قەڵاکەیان نوژەن کردەوە و «دارولحکومە»ی سنەیان تیا دەرهاورد، کە ئەم مێژووە دەبێتە چوارسەد ساڵ لەمەوبەر، بەڵام سنە زۆر کۆنترە، شاری سنە بەدرێژایی مێژووەکەی شارێکی حاکمنشین بووە، هەمیشە وەکوو تارانێکی چکۆلە بووە لە بواری فەرهەنگیەوە ناوی لە ناواندا بووە و بە پێگەیەکی گرنگ باس کراوە، خەڵکی سنە هەمیشە کۆڕی شەوانیان هەبووە، لەگەڵ یەکتر باسی موسیقا و باسی ئەدەبیات و باسی شیعر و ئەم شتانەیان کردووە، هۆکاریش ئەوە بووە لە سنە کەسانێک هەڵکەوتوون و لە بواری رۆشنبیری و ئەدەبیات و هونەردا کاری گەورەیان کردووە و ناویان دەدرەوشێتەوە. بەڵام خۆ لە کوردستانی رۆژهەڵاتدا تەنیا سنە زێدی هونەرمەندان نییە، مەسەڵەن کەسێکی وەکوو حەسەن زیرەک خەڵکی بۆکان بووە، یا حەمەی ماملێ خەڵکی مەهاباد

بـووه، بـەڵام سـنە چونکـە شـارێکی حاکمنشـین بـووە، ناوەنـدی قورسـایی و پێگـەی کـوردەواری بـووە، بـەو هۆیـەوە لـە شـارەکانی تـر ناودارتـرە، ئەگینـا لـە هەمـوو شـارێک لـە هەمـوو ناوچەیـەک کەسـانێک هـەن و بووگـن و حەتـا زەحمەتـی زۆریشـیان کێشـاوە بـۆ هونـەر و فەرهەنـگ، بـۆ کرمشـان کـەم هونەرمەنـد و ئەدیـب و خەڵکـی مانـدوو و نـاوداری تێدایـە؟

**(پ): بەپێـی ئـەو هەواڵانـەی پێـم گەیشـتوون، بەنیـازی لـەم نزیکانـەدا پێشـانگەیەکی شـێوەکاری لـە سـلێمانی بکەیتـەوە، ئەمـە چۆنـە و چەنـد تابلۆیـە و چـۆن رێکخـراوە؟**

عەباسـی کەمەنـدی: بـە سوپاسـەوە دامودەزگـەی وەزارەتـی رۆشـنبیری لـە سـلێمانی ئـەو دەرفەتـەم بـۆ دەرەخسـێنن و تـا چەنـد رۆژێکـی تـر ئـەو تابلۆیانـە تێرمـە سـلێمانی و رەنگـە پتـر لـە ٤٠ تابلـۆی نیگارکێشـی بـن و بەرهەمـی کاری نیگارکێشـیی ئـەم چەنـد ساڵەی دواییمـن، سوپاسـی ئـەو بەڕێزانـە دەکـەم کـە ئەرک دەکێشـن لەگـەڵ ئـەو پێشـانگەیەم، ئەگـەر دەرفـەت هەبـوو، دوای سـلێمانی، تابلـۆکان دەبەمـە هەولێـر و لەوێـش نماییشـیان دەکـەم بـۆ خەڵکـی هەولێـری خۆشەویسـت. (دوای ئـەم دیمانەیـە پێشـانگەکەی لـە سـلێمانی کرایـەوە – بەرهـەم عەلـی)

**(پ): خەونی هەرە گەورەی عەباسی کەمەندی چییە؟**

عەباسی کەمەندی: وەڵا لە لایەلای قسەکانما عەرزم کردی، گوتم کە ئاواتم ئەوەیە کە خەڵکەکە ژیانێکی ئاسابیان هەبێ و لە ئارامی و ئاشتی و ئازادی و ئاسوودەییدا بژین، منداڵەکانم راحەتی و ئاسایشێکیان هەبێ و خەونە مەزنەکانی کورد بێنە دی، ئیتر ئەمە ئاواتە باڵاکانی منە.

## تاکە سەرکردەیەك کە وێنەیم کێشاوە

**(پ): لە بواری نیگارکێشیدا هیچ کاتێک وێنەی سەرکردەیەک یان کەسایەتییەکی سیاسیی کوردت کێشاوە؟**

عەباسی کەمەندی: بەڵێ وەڵا کێشاومە.

**(پ): وێنەی کێ و کێت کێشاوە؟ وەکوو سەرکردە سیاسییەکان، ئەو سەرکردانەی لەناو کوردا ناویان هەبووە؟**

عەباسی کەمەندی: تەنیا وێنەی مەلا مستەفای بارزانیم کێشاوە.

**(پ): بۆچی بە تەنیا وێنەی ئەو سەرکردەیەت کێشاوە؟**

عەباسی کەمەندی: لەبەرئەوەی بیرەوەریی منداڵی و جەوانیم تەنیا لەگەڵ ئەو سەرکردەیەدا هەیە، ئەو بەلای منەوە

گەورەترین سەرکردە بووە کە هەر لە منداڵییەوە چاوم کردەوە چاوم بە وێنەکەی کەوت، کاتێ جەوان بووم وێنەیەکی مەلا مستەفای بارزانیم کڕی، بەسەر ئەسپێکی سپییەوە بوو، هەر لەو تەمەنەوە پێی سەرسام بووم و خۆشمویست، بۆیە وەختێ دەستم دایە هونەری نیگارکێشیش، هەر هەمان ئەو وێنەیەم دروست کردەوە، هەڵبەت نەک تەنیا وێنە، بەڵکوو شیعریشم هەیە بەسەر ئەو سەرکردەیەدا.

**(پ): لە بەشێکی پێشووتری ئەم گفتوگۆیەدا، گوتت تەنیا ئەوەندە منەتم بە ژیان ماوە، کە کارەکانم تەواو بکەم و چیتر لە مێشکمدا پەنگ نەخۆنەوە، ئاخۆ لە هەموو ئەو پرۆژانەی کە ماوتن، کامیان بە زۆر زەروور دەزانی، بەر لە مردن تەواوی بکەیت؟**

عەباسی کەمەندی: وەڵا راستییەکەیت ئەگەر گەرەکە، لە هەموویان گرنگتر کاری ئەلبوومی گۆرانییەکانە، ئەوەی کە گوتم بە یاوەریی مۆزیکژەنانی یۆنانی دەمەوێ ئەلبوومێکی گۆرانیی کوردی دەربکەم، حەز دەکەم بەو شێوەیەی کە لە مۆخ (مێشک) و لە هەستمدا هەیە، بەرهەمی بهێنم، ئیدی باقیی کارەکانی ترم بکرێ یا نەکرێ، بۆم زۆر موهیم نییە.

**(پ): لەنێو هەرێمی کوردستانی عێراق واتە باشووری کوردستان،**

**زۆرترین هەوادار و عاشقی دەنگت هەن، کەچی کەمترین سەردانت کردووە بۆ کوردستانی باشوور، هۆکاری ئەو کەم سەردانییە چییە؟**

عەباسی کەمەندی: بەخوا من دوو جار هاتوومە ئەودیو، ئیتر هەر ئەوەندەم پێ کراوە، چونکە سەرقاڵی کار و ژیانم، زۆر سوپاس و رێز و خۆشەویستیم هەیە بۆ ئەوانەی من و هونەرەکەمیان خۆش دەوێ، منیان خۆش دەوێ، بەنیازم چەندە پێم بکرێ، بێم و کارەکانی خۆم نمایش بکەم، من حەز دەکەم کە هاتم، بە کار و بەرهەمەوە بێم، نەک بە دەستبەتاڵی، سوپاسی هەموو ئەوانەش دەکەم کە هاوکارییان کردووم، تا لە کارکردن بەردەوام بم، من لە هەر شوێنێک ببینم ئیحترامی خۆم و کارەکانم ئەگیرێ بەئاسوودەگییەوە رووی تێ دەکەم، بەڵام ئەگەر یەک زەڕرە بێ ئیحترامی ببینم، پای هەموو دنیا سامانم بدەنێ رووی تێ ناکەم.

**(پ): دوا قسەتان بۆ خوێنەرانی هەفتەنامەی (باس) و بۆ ئەوانەی هونەری تۆیان خۆش دەوێ، چییە؟**

عەباسی کەمەندی: هەمووتانم خۆش دەوێ و هەمووتان بە خوای گەورە ئەسپێرم و ئومیدەوارم هەتاهەتایە خۆشبەخت و سەربەخۆ بن و بە عیشق و بە موحەبەتەوە بژین.

## هونەرمەند عەباسی کەمەندی سەردانی (باس)ی کرد

رۆژی (٢٤-١٢-٢٠١٢) واتە دوای ئەو دیمانەیە، هونەرمەندی مەزن عەباسی کەمەندی، دوای ئەوەی لە شاری سلێمانی پێشانگایەکی بۆ نزیکەی ٤٠ تابلۆی کردەوە، هەر لە سەروبەندی ئەو چالاکییەیدا، سەردانی شاری هەولێری کرد و هاتە دەزگای میدیایی (باس) ئەودەم بەم شێوەیە، هەواڵەکەیمان بڵاو کردەوە:

### هەولێر(باس)

لە سەردانێکیدا بۆ شاری هەولێر، نێوەڕۆی دوێنی هونەرمەندی ناوداری کورد، عەباسی کەمەندی، سەردانێکی تایبەتی بارەگای دەزگای میدیایی (باس)ی کرد و لەلایەن بۆتان تەحسین خاوەن ئیمتیاز و بەرهەم عەلی سەرنووسەر و ستافی رۆژنامەکەوە، بەگەرمی پێشوازیی لێ کرا.

لەو سەردانەیدا، کەمەندی لە نزیکەوە، دەستخۆشیی لە کارمەندانی هەفتەنامەکە کرد و (باس)ی بە یەکێک لە رۆژنامە جوان و سەرکەوتووەکانی هەرێمی کوردستان وەسف کرد و بەخێرایی چاوی خشاند بەو دیمانە رۆژنامەوانییەی، کە بە درێژایی چوار ئەڵقە لە چوار ژمارەی (باس)دا لە ماوەی

رابـردوودا بـڵاو بـووەوە، سوپاسـی ڕۆژنامەکـەی کـرد، کـە بـەردەوام بایەخـی بـە هـەواڵ و دەنگوباسـی ئـەو و چالاکییـە کولتـووری و هونەرییـە کوردسـتانییەکان داوە.

لـە گفتوگۆیەکدا لەگـەڵ خـاوەن ئیمتیـاز و سەرنووسـەری (بـاس) دا، هونەرمەنـد عەباسـی کەمەنـدی، تاوتـوی هەنـدێ پـرس و باسـی هونـەری و کولتـووری و ڕەسـەنایەتی کـرد، ئەوەشـی ڕاگەیانـد کـە لـە ئاینـدەدا دوو سـی دیـی گۆرانـی بـڵاو دەکاتـەوە و دیوانـە شیعرییەکەشـی چـاپ دەبـێ.

سوپاسـی ئـەو پێشـوازییە گەرمـەی خەڵکـی کوردسـتانی باشووریشـی کـرد، کـە لـە چەنـد ڕۆژی ڕابـردوودا، لـە سلێمانی و لـە هەولێـر لێیـان کـردووە.

کەمەنـدی بەڵێنـی ئـەوەی دا، کـە لـە نزیکتریـن دەرفەتـدا، دەگەڕێتـەوە هەولێـر و پێشـانگەی شـێوەکاری و کـۆڕی شـیعری لـە هەولێـر سـاز دەدات.

ڕاشـی گەیانـد کـە ئێسـتە لەبـەر بـاری تەندروسـتیی خـۆی، ناتوانـێ زیاتـر بمێنێتـەوە.

لـە کۆتایـی ئـەو دیـدارەدا عەباسـی کەمەنـدی، دانەیەکـی ڕەسـەنی لـە تازەتریـن سـی دیـی بەنـاوی (کیـژی کـورد- کیـژی لادێ) پێشـکەش بـە هەفتەنامـەی (بـاس) کـرد.

## وتاریك بۆ مەرگی کەمەندی

چەنـد رۆژێـک دوای کۆچـی دوایـی کەمەنـدی، ئـەم وتـارەم لـە هەفتەنامـەی (بـاس)دا بـڵاو کـردەوە، لێـرەدا جارێکـی تـر وەکـوو خـۆی بـڵاوی دەکەمـەوە:

**"ئێش ناهێڵێ ئیش کەم"**

**دەمزانی (مامۆستای حەوت هونەر) زۆری نەماوە لە ژیاندا!**

بەرهەم عەلی

پێنجشـەممەی رابـردوو، ئـەو رۆژە بـوو کـە نزیکـەی دوو سـاڵێک بـوو لێـی دەترسـام، نازانـم لـە خۆشەویسـتیی زۆرم بـوو بۆ ئـەو، یـان هەسـتی بینینـی ئاینـدەم بەهێـز بـوو، یاخـود بینینـی لەنزیکـەوە ئـەو هەسـتەی لا دروسـت کـردم کـە ئـەم پیـاوە جوانـە، ئـەم دەروێشـە نوورانـی و خەیـاڵ پـڕ و رۆشـنفکر و داهێنـەرەی بـواری هونـەر و ئـەدەب و میدیـا و مێـژوو و فۆلکلـۆر و کەلەپـووری کـورد، زۆری نەمـاوە لـە ژیانـدا، پێشـنبینیم دەکـرد رۆژێـک دێ و مەرگـی عەباسـی کەمەنـدی هەمـووان دەتاسـێنێ، ئـەو رۆژەش نزیکـە!

پێشـتر بـەردەوام پەیوەندیـی تەلەفۆنیـم لەگەڵیـدا هەبـوو، زۆر

سوودم لە بیر و بۆچوونەکانی وەرگرت، بەڵام پتر لە مانگێک بەر لە ئێستا لە رێی مۆبایلەوە سێ جار پەیوەندیم پێوە کرد، دوو جاریان خانمی هاوسەری وەڵامی دامەوە و گوتی ئاغای کەمەندی بە ئیشێک چووەتە کرماشان و مۆبایلی لەگەڵ خۆی نەبردووە، سێیەم جار پەیوەندیم پێوە کردەوە، ئەمجارە مامۆستا مەزنەکە خۆی وەڵامی دامەوە، نوزەی دەنگی لە جاران نزمتر، لە جاران کزتر و قسەکانیشی لە جاران بێ وەرەتر هاتە بەرگوێم، دڵەخورپەیەک دایگرتم، نازانم بۆ وا رەشبین بووم، دیسان هەستم کرد مەرگی ئەم مرۆڤە گەورەیە نزیکە! پێی گوتم: "ئەوە دوو بەهارە دێت و دەڕوا، من هەر بەهیوا بووم خۆت و بنەماڵەت بێنە سنە، هەر نەهاتن"، پاساو و عوزرخواییم بۆ هێنایەوە، دوای گفتوگۆیەکی زۆر، پرسیم: "مامۆستا گیان، منیش هەموو بەهارێک چاوەڕێم ئیشێکی تازەی تۆ ببینم، ئیشە تازەکانت گەیشتنە کوێ؟" وەڵامێکی دامەوە کە تەنیا لە کەسانی وەک خۆی پاک و زانا دەوەشێتەوە: "مەخابن.. ئێش ناهێڵێ ئیش کەم".

## تەنیا یەک عەباسی کەمەندی

بە بڕوای من، یەزدانی مەزن و ئافریدەی ژیان، کە میللەتێکی خۆشویست، کەسێکی وەک عەباسی کەمەندیی بۆ خەلق دەکات، ئەو میللەتەش سەرپشک دەکا چۆن رێزی لێ دەگرن،

بەش بەحاڵـی خـۆم هەمـوو دەمـێ کـە گـوێ لـە گۆرانیـی کەمەنـدی دەگـرم، شـانازم بـە کوردبوونـی خـۆم، خۆشـحاڵم کـە هاونەتـەوەی کەسـایەتییەکی ئەوهـام. بۆیـە هیـوادارم کـەس بـە زێدەڕۆیـی تێنـەگات کـە دەڵێـم: تـا ئەبـەد کـورد داهێنەرێکـی وەک عەباسـی کەمەندیـی تێـدا هەڵناکەوێتـەوە، کـورد یـەک جـار بەختـی ئـەوەی دەبێـت کەسـێکی وەک کەمەندیـی بـۆ دروسـت بـێ، ئەویـش چـوو.. ئێـوەش لەگـەڵ منـدا بیـر بکەنـەوە، ئـەرێ بەڕاسـت هیـچ هونەرمەندێکـی کـورد هەیـە، بتوانـێ وەک عەباسـی کەمەنـدی گۆرانیـی تـەواو کـوردی بچـڕێ؟ کـەس هەیـە زیاتـر لـە ٤٠ سـاڵی تەمەنـی، لـە کۆکردنـەوەی حیکایـەت و چیـرۆک و داسـتان و گۆرانـی و کەسـایەتیی فۆلکلۆریـی میللەتەکەیـدا تەرخـان بـکات؟ کـەس هەیـە لـە یـەک کاتـدا بتوانـێ (چیرۆکنـووس و مێژوونـووس و فۆلکلـۆر کۆکـەرەوە و شـاعیر و گۆرانیبێـژ و ئاوازدانـەر و نیگارکێـش و شـانۆنووس و سـینەماکار و میدیـاکار و دۆبـلاژکار و مامۆسـتا) بـێ و لـە هـەر هەمووشـیاندا بەرهەمگەلێکـی زۆر دانسـقە و نایابـی هەبـێ، کـە نـە لـە بەرهەمـی کـەس بچـێ و نـە هـی کـەس لـەو بچـێ؟ ئاخـر بەشـێک لـە میدیـا کوردسـتانی و ئێرانییـەکان راسـت دەبێـژن کـە ناویـان نـاوە (مامۆسـتای حـەوت هونـەر).

کەمەنـدی لـە دیمانەیەکـی تایبـەت بـە هەفتەنامـەی (بـاس)دا کـە مـن بـۆ هەمـوو ژیانـی رۆژنامەنووسـیم شـانازیی پێـوە دەکـەم، لەمبارەیـەوە گوتـی: "پایـزان شـیعر دەهۆنمـەوە، زسـتانان نیـگار دەکێشـم، بەهـاران ئـاواز دادەنێـم و گۆرانـی دەچـڕم، هاوینانیـش

چیـرۆک و فیلمنامـه دەنووسـم".

## دیارییەکانی کەمەندی.. سامانە گەورەکەم

هەرکەسێ لـە مـاوەی سـاڵ و نیـوی رابـردوودا سـەردانی ئۆفیسـەکەی منـی کردبـێ لـە بـارەگای هەفتەنامـەی (بـاس)، بـێ شـک ئـەو وێنـە هەڵواسـراوەی بینیـوە کـە دەسـتم کردووەتـە ملـی عەباسـی کەمەنـدی و شاگەشـکەییەکی وەهـا بـە رووخسـارمەوە دیـارە، وەک بڵێـی دەسـتم لـە ملـی پەیامهێنێکـدا بـێ.

مـن خـۆم بـە بەختەوەرتریـن کـەس دەزانـم کـە رۆژگار وای بـۆ هێنـام، لـەم دواییـەدا بوومـە هاورێـی نزیکـی عەباسـی کەمەنـدی، کەمەندییـەک کـە لـە تافـی هەرزەکاریمـەوە تـا ئێسـتە بـە هونـەری بـاڵای، کاریگەرییەکـی زۆری لەسـەر شـێوازی بیرکردنـەوەم و دیـدم بـۆ گۆرانـی و ئـەدەب و مۆزیکـی کـوردی دانـاوە، چـۆن ئاسـوودە نەبـم کـە وەک رۆژنامەنووسـێک توانیـم درێژتریـن دیمانـە لەگـەڵ عەباسـی کەمەندیـدا سـاز بـدەم، رەنگـە تەنیـا ماڵباتـی عەباسـی کەمەنـدی و دۆسـتانی زۆر نزیکـی هێنـدەی مـن یـادگاری و دیاریـی ئـەو هونەرمەندەیـان لابـێ، سـێ تابلـۆی گـەورە بـە ناونیشـانەکانی (داری ئەنفـال، میـری نـەورۆزی، گەندەڵـی) کـە هەرسـێکیان لـە دەسـتکردی عەباسـی کەمەندیـن و بـە دیـاری پێشکەشـی کـردووم، لای مـن پارێـزراون، سـی دیـی (کیـژی کـورد) کـە بـە دەسـتی خـۆی پێشکەشـی کـردم، هەروەهـا ٣٦ چیـرۆک و فیلمنامـەی فۆلکلـۆری کـوردی (سـیناریۆ) بـە دەسـتخەتی خـۆی نووسـراون و بـە نامـەی

دەستخەتی خۆی سەرپشکی کردووم لە هەفتەنامەی (باس)دا بڵاویان بکەمەوە یان هەر مامەڵەیەکیان لەگەڵ بکەم، بە هەمان شێوە لای من پارێزراون، هەروەها دوو دیوانی گەورەی شیعری (کوردی و فارسی)ی بەر لە چاپکردنیان پێشکەش کردووم.

هەروەها ئەو رۆژەی هاتە بارەگای دەزگای میدیایی (باس) لە ئۆفیسەکەمان کووپێک قاوەی خواردەوە، ئەو کووپەی قاوەکەی تێدا خواردەوە، هەر هەمان رۆژ هەڵمگرت و تا ئێستا پاراستوومە.

ئەمە جگە لەو نامە جوانانەی چ بە ئیمەیل، یان بە SMS ی مۆبایل بۆی ناردووم، من نەک هەر بەختەوەرترین کەس، بەڵکوو دەوڵەمەندترین کەسم بەم هۆیەوە.

## گۆشەگیریی کەمەندی

هەمووان دەیانزانی عەباسی کەمەندی مرۆڤێکی گۆشەگیرە، بەڵام گۆشەگیریی کەمەندی، لە گۆشەگیریی هیچ کەسێک نەدەچوو، گۆشەگیرییەک تژی لە داهێنان، گۆشەگیرییەک کە چەندین کتێبی گەورەی مێژوویی و سەدان سیناریۆ و فیلمنامەی فۆلکلۆریی کوردی و دەیان نیگاری پڕ ڕەنگ و بۆی کوردانە و هەزاران بەیتەشیعری ناسک و ئاواز و گۆرانیی تەواو رەسەنی کوردەواریی لێ لەدایک دەبوو، ئەو شەوانە وەک زۆربەمان، ژوورەکەی بە دوکەڵی جگەرە قانگ دەدا، تەپڵەکی جگەرەکەی پڕ دەبوو لە فلتەری جگەرەی تا بن کێشراو، بەڵام جیاوازیی

لەگـەڵ ئێمـەدا ئـەوە بـوو، ئـەو دەیـان لاپـەڕەی پـڕ دەکـردەوە و هـەر وشـەیەکی کەمەنـدی کـە بـەو ڕێنـووس و شـێوەزارە کوردییـە تایبەتـەی دەینووسـین، کێـش و بەهـای گەنجینەیەکـی پـڕ لـە گەوهـەری دانسـقەی هەبـوو، بـەڵام بۆچـی هەتـا لـە ژیانـدا بـوو، دەسـتی دروسـتکەری ئـەم گەنجینەیەمـان لـە زێـڕ نەگـرت؟ ئەمـە پرسـیارێکە بـەدوای مەرگـی هەمـوو داهێنەرێکـی کـوردا، سـەرە ڕێـی بیرکردنەوەمـان لـێ دەگـرێ.

## ئازارەکانی کەمەندی

عەباسـی کەمەنـدی لـە ژیانیـدا زۆر مانـدوو بـوو، کەسـانێکی زۆر ئازاریـان دا، خەڵکانێکـی زۆر درۆیـان لەگـەڵ کـرد و غەدریـان لـێ کـرد، بەشـێکی زۆر لـە بەرهەمەکانـی، لەبـن سانسـۆری دەزگاگەلـی فەرهەنگیـی ئێرانـدا دەرنەچـوو و تـا ئێسـتەش ڕۆشـناییان نەبینـی، لـە بەرامبـەر هەمـوو ئەمانەشـدا، کەمەنـدی تەنیـا خۆخواردنـەوە و خەمـی قـووڵ و ماتەمێکـی هونەرمەندانـە دای دەگـرت و جارجـارەش ئـەو خەمانـەی دەکـردە نووسـین، کەمەنـدی بـە پێچەوانـەی ئەوانـەی ئەشـکەنجەیان دەدا، هەرگیـز نەیتوانـی ئـازاری کـەس بـدا، درۆی لەگـەڵ کـەس پـێ نەکـرا، ئـەو زۆر کاری کـرد و کـەم ڕێـزی لـێ گیـرا، کـەم کـەس هەبـوو بـە هونـەری بـاڵای کەمەنـدی سەرسـام نەبـێ، بـەڵام کـەم کەسـیش هەبـوو ئـاگای لـە حاڵـی ناهەمـواری ژیانـی بـێ.

ڕەنگە من یەکێک بم لەو کەسانەی لە ئاست مەرگی هونەرمەندی گەورە (عەباسی کەمەندی) زۆر نا، کەمێک ویژدانم ئاسوودە بێ، (دوایی پێتان دەڵێم بۆچی) بەڵام دیسان کە هەواڵی مەرگی ئەو ئینسانە مەزنەم بیست، هەستم بە ئازاری ویژدان دەکرد، وەک چۆن لە ژیانی کەمەندیدا حەزم بە کوردبوونی خۆم دەکرد، ئاوهاش لە مەرگیدا رقم لە کوردبوونی خۆم دەبۆوە، هەمان ئەو بەیانییەی مەرگی، لەنێو ئۆتۆمبێلەکەدا سی دییەکەی (کیژی کوردی کەمەندی)م، خستە ناو ریکۆردەرەکە و لەگەڵیدا، بۆ دووەم جار هێدی هێدی هەنسکی گریان بووەوە میوانم، زۆر گریام، گریانێکی بەکوڵ، کە زۆر لەمێژ بوو، ئاوا لەناخەوە نەگریابووم، وەک ئەوەی کەسێکی هەرە نزیک لە خۆم و لە روح و لە هەستم، کۆچی دوایی کردبێ و منیش هەست بە گوناحێکی گەورە بکەم لەئاست مەرگیدا.

## یادگارییەکانم لەگەڵ کەمەندی

یادگاریی من لەگەڵ عەباسی کەمەندی لە هەرزەکاریمەوە دەست پێ دەکات، ئەو دەمەی گوێم لە گۆرانییەکانی سەبریی گوڵفرۆش (لەگەڵ شەهێن تاڵەبانی) و ئەمشەو شەوی بەراتە و ئەی لە گەلاوێژ و ئەوانی تر دەگرت، لەوێ رۆژگاری تەمەنمەوە، لەگەڵ دەنگی کەمەندیدا گەورە بووم، کە دەستم بە کاری رۆژنامەوانی کرد هەموو ئاواتم ئەوە بوو، دیدارێک لەگەڵ ئەم

هونەرمەنـدە سـاز بکـەم، دواجـار ئـەو خەونـەم هاتـە دی.. بـەڵام چـۆن؟

## بەدەنگەوەهاتن

لـە ژمـارەی ڕۆژی ٢٠-٧-٢٠١٢ی ڕۆژنامـەی (خەبـات- پاشـکۆی هـزر و هونـەر)، وتارێکـی عەباسـی کەمەندیـم خوێنـدەوە، ئـەو وتـارەی بـە زمانـی فارسـی لـە گۆڤارێکـی ئێرانیـدا بـڵاو کردبـووەوە و کاروان حەسـەن وەری گێڕابـووە سـەر زمانـی کـوردی، لـەو وتـارەدا کەمەنـدی باسـی لـە کێشـەکانی ژیـان و گوزەرانـی خـۆی کردبـوو و گلەییەکـی زۆری لـە بەرپرسـانی فەرهەنگیـی ئێرانـی کردبـوو.

دوای خوێندنـەوەی ئـەو وتـارە، خەمێکـی قـوڵ دایگرتـم: "چـۆن دەبـێ داهێنەرێکـی وەک کەمەنـدی بـێ لانـە بـێ؟!" دەمزانـی لـەڕووی دەروونیـەوە هەڵچـووم، بۆیـە نەمویسـت سـارد ببمـەوە و هـەر ئـەو شـەوە لەوپـەڕی تووڕەییـدا نامەیەکـی کـراوەم ئاراسـتەی بەڕێـز نێچیرڤـان بارزانـی سـەرۆکی حکوومەتـی هەرێمـی کوردسـتان کـرد و لەژێـر سـەردێڕی (بەڕێـز سـەرۆکی حکوومـەت.. عەباسـی کەمەنـدی کرێچییـە) لـە ژمـارەی ڕۆژی ٢٤-٧-٢٠١٢ی هەفتەنامـەی (بـاس)دا بـڵاو کـردەوە، کـە لـە بەشـێکیدا نووسـیومە: (بەڕێـز کاک نێچیرڤـان.. بەڕاسـتی کفـر و گوناهێکـی گەورەیـە ئێمـە وەزارەتـی ڕۆشـنبیریمان هەبـێ و خۆمـان بـە کـورد بزانیـن و لـە بەشـێکی تـری کوردسـتان، ڕۆشـنبیر و هونەرمەندێکـی مەزنـی وەک عەباسـی

کەمەنـدی کرێچـی بـێ و لەبـەر فشـاری قیسـتی خـاوەن مـاڵ و خـاوەن قـەرزەکان، گەورەتریـن داهێنانەکانـی هەرزانفـرۆش بـکات و ئەوجـا دەستیشـی ببـڕن.. عەیبـە ئێمـە لێـرە بـە هـەزاران دۆنـم زەوی بدەینـە کەسـانێکی گەنـدەڵ بەنـاوی پـرۆژەی هونەرییـەوە، لـەولاش عەباسـی کەمەنـدی ژوورێکـی نەبـێ تیـای بـژی".

خۆشـبەختانە رۆژێـک دوای بڵاوبوونـەوەی نامەکـە، بەڕێـز ئیجـرا بارزانـی بەنـاوی کاک نێچیرڤـان بارزانییـەوە پەیوەندیـی پێـوە کـردم و دەستخۆشـیی وتارەکـەی لـێ کـردم و گوتـی: "جەنابـی کاک نێچیرڤـان دەڵـێ کاک عەباسـی کەمەندیـی هەرچـی بوێـت بـۆی دەکەیـن، بـۆ ئـەوەی لـەو کارە جوانانـەی بـەردەوام بێـت" , کاک ئیجرا گوتیشـی: "پەیوەندیـی پێـوە بکـە و هەرچـی ئـەو دەیخوازێـت بـە نامەیـەک بۆمـان بنووسـە". ئیـدی تـۆپ کەوتـەوە گۆڕەپانـی مـن، لەڕێـی هـاوکارم عەزیـز مورادییـەوە بـە سـێ رۆژ ئنجـا توانیـم ژمـارە تەلەفۆنـی کەمەنـدی پەیـدا بکـەم و تەماسـی لەگـەڵ بگـرم، ئـەوە یەکەمیـن جـارم بـوو، قسـە لەگـەڵ ئـەو هونەرمەنـدە گەورەیـەدا بکـەم، کـە خـۆم پـێ ناسـاند بەپێکەنینـەوە پرسـی: "چیـت لەسـەر مـن نووسـیوە؟ لـەو رۆژەوە دەیـان کـەس پەیوەندیـی پێـوە کـردووم و دەڵێـن شـتێکی جـوان لەبـارەی تـۆوە لـە (بـاس)دا نووسـراوە". هەمـوو قسـەکانی کاک ئیجـرام بـۆ کەمەنـدی گێڕایـەوە، لـەوێ زانیـم عـزەت نەفسـی کەمەنـدی هێنـدەی هونەرەکـەی بـەرزە. ئـەو گوتـی: "سوپاسـی تـۆ و کاک نێچیرڤانیـش دەکـەم، بـەڵام مـن لـەو وتـارەدا گلەییـم لـە بەرپرسـانی فەرهەنگیـی ئێـران کـردووە، داوای هیـچ

شتێکم لە حکومەتی هەرێمی کوردستان نەکردووە، هیچم ناوێ تەنیا خۆشی و سەرکەوتنی ئەوان نەبێ"..

کەمەندی گوتیشی: "من لە هەموو ژیانمدا ئەگەر وێنەی کەسایەتیم کێشابێ، تەنیا وێنەی مەلا مستەفای بارزانیم کێشاوە، ئەویش لەسەر دوو دەورییە".. رەنگە ئەگەر هەموو گفتوگۆکەمان بگێڕمەوە، زۆری بوێت، بەڵام پاش پێنج پەیوەندیی تەلەفۆنی، تکام زۆر لێ کرد و پێم گوت ئەمە دەرفەتێکی زێڕینە بۆ تۆ، تا چیتر لە خەمی گوزەراندا نەبیت و سەرقاڵی داهێنانەکانت بیت، دواجار پاش چەندین پەیوەندی قەناعەتی هات و ئەو بڕە پارەیەی ویست کە پاشماوەی قەرزی خانووێک بوو لەسەری و بڕێکیش بۆ کارەکانی، دەمەوێ ئەوەش بڵێم کە لەو دەمەدا ئەو بڕە هاوکارییە بۆ دۆخی ئابووریی کوردستانی باشوور بڕێکی وەها زۆر نەبوو، بەڵام دیار بوو لە کوردستانی رۆژهەڵات (ئێران) دەکرا پێویستیی باشی پێ پڕ بکرێتەوە، چونکە بەهای تومەنی ئێرانی زۆر دابەزیبوو. بە دوای ئەوەدا نامەیەکم بۆ کاک نێچیرڤان نووسی و خۆشبەختانە پاش ماوەیەک لەرێی کاک ئیجرا بارزانییەوە پارەکەم پێ گەیشت و منیش بەهاوکاریی هاوڕێم بۆتان تەحسین، لەرێی نووسینگەیەکی حەواڵەوە هاوکارییەکەم بۆ نارد، نزیکەی ١٥ رۆژێک دوای ئەوە، لە سلێمانیەوە دەهاتمەوە، لەنێو کەرکووکدا کورتەنامەیەکی مۆبایلی عەباسی کەمەندیم پێ گەیشت، تیایدا نووسیبووی: "سوپاس بۆ تۆ و بۆ کاک نێچیرڤان بارزانی، قەرزەکانم دایەوە و کێشە داراییەکانم چارەسەر

بوون، ئەگەر بڵێم هەشت نۆ ساڵە وەک ئەم سێ شەوەی رابردوو بە راحەت نەخەوتووم، درۆ ناکەم".

پاش ئەو کورتەنامەیە، سێ تابلۆی دەستکردی خۆی و دیوانەکەیی بەدیاری لە رێگەی هاورێم عەزیز موراديیەوە بۆ ناردم، بە دوای ئەوەشدا سوپاسنامەیەک و دوو دەوريی چينكۆی بۆ کاک نێچیرڤان بارزانی نارد، کە هەردووکیان وێنەی مەلا مستەفای بارزانیی بە دەستی خۆی لەسەریان دروست کردبوو، ساڵانێک لەوەبەر دروستی کردبوون، ئەوانەشم گەیاند.

بەڵام بەختەوەریی هەرە گەورەم رۆژی (٢٤-١٢-٢٠١٢) بوو، کە عەباسی کەمەندی هاتە شاری هەولێر و سەردانی بارەگای هەفتەنامەی (باس)ی کرد، ئەو رۆژە بە کامی دڵی خۆم دواندم و خۆم و هاوکارانم وێنەی یادگاریمان لەگەڵ گرت.

## سەرەخۆشی

سەرلەبەیانیی رۆژی پێنجشەمەی رابردوو ٢٢-٥-٢٠١٤، لە خەوێکی قوڵدا بووم کە زەنگی مۆبایل بەخەبەری هێنام و هاوار عەبدولرەزاقی هاوکار و برازام هەواڵی مەرگی عەباسی کەمەندیی پێ راگەیاندم، ناز عەبدوڵای هاوسەرم کە یەکێک لە ئاواتەکانی ئەوە بوو ئاهەنگێکی رێزلێنان بۆ عەباسی کەمەندی لە هەولێر ساز بدرێ و ئەو پێشکەشی بکات، لەگەڵ مندا دڵی پڕ بوو. جارێکی تر تەماشای شاشەی مۆبایلەکەمم کرد،

هـاوكارم مامەيـارەش بەرلـەوە زەنگـی بـۆ لـێ دابـووم، توومـەس ئەویـش هەمـان هەواڵـی پێیـە، بـە دوای ئـەودا نامەیەكـی ئاشـنا عەبـدوڵای بێـژەری زاگـرۆس تـی ڤـی و زەنگـی ئـاڵای خوشـكم و شـنەی خوشـكم و دڵشـاد غەفـوری هـاوڕێ و پسـمام و هاوڕێـی ئازیـزم هێـرۆ ئیسـماعیل بێـژەری كوردسـتان تـی ڤییـم بـۆ هـات، هەمـووان سەرخۆشـییان لـە مـن دەكـرد و دڵنەواییـان دەدامـەوە، تەنانـەت هێـرۆ ئیسـماعیلی هاوڕێـم كـە جـار بەجـار لەگـەڵ ئەو باسـی هونـەری بـاڵای عەباسـی كەمەندیمـان كـردووە و ئەویـش یەكێكـە لـە عاشـقانی دەنگـی كەمەنـدی، پێـی گوتـم: "دەزانـم لـە دوای هاوسـەر و كـوڕ و كچەكانـی، تـۆ لـە هەمـوو كـەس خەمبارتـری بـۆ مەرگـی كەمەنـدی، بۆیـە تێلـم بـۆ كردیـت تـا سەرخۆشـییت لـێ بكـەم".

ئێسـتا، ئـەوە پێنـج ڕۆژە، هـەر كـە گوێـم لـە گۆرانییـەكان كەمەندی دەبـێ، چاوەكانـم تـەڕ دەبـن، نازانـم چـۆن وشـك دەبنـەوە، ئێوارانـێ كـە دوای كاركـردن بـەرەو ماڵـەوە بـەڕێ دەكەومـەوە، بەتەنیـا گـوێ لـە كەمەنـدی دەگـرم و بـەدەم لێخوڕینـی ئۆتۆمبێلـەوە جۆگـەی فرمێسـك لـە چاوەكانمـەوە دەچـۆڕێ، دەزانـم وەختـی كۆچـی ئـەو مرۆڤـە نەبـوو، بـەڵام لـەوەش دڵنیـام كـە لەودنیـاش فریشـتەكان بـە گۆرانییەكانـی كەمەنـدی ئارامـی و سـوكنایی بـە دڵـی خۆیـان دەدەنـەوە.

## ئەو وتارەی پێش مەرگی کەمەندی
## لە هەفتەنامەی (باس) بڵاوم کردەوە

بەڕێز سەرۆکی حکوومەت ...

عەباسی کەمەندی کرێچییە

بەرهەم عەلی

دەبوو ئەم پەیامەم ئاراستەی وەزارەتی رۆشنبیریی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بکردایە، بەڵام دڵنیام لەوەی وەزارەتی رۆشنبیری (تەقەی سەری دێ) و هەزار پەیامی لەم شێوەیەی ئاراستە بکرێ (مێش میوانی نابێ!)، ئاخر بڕوا ناکەم ئەو وەزارەتە لە گەورەیی هونەرمەند و رۆشنبیری مەزن (عەباسی کەمەندی) بگات، بۆیە من و زۆرانی تریش ناچار دەبین لە حاڵێکی ئاوهادا روو لە بەڕێزت بکەین.

بەڕێز کاک نێچیرڤان..

بڕوا ناکەم بەڕێزت بە هونەری باڵای عەباسی کەمەندی سەرسام نەبیت و نەیناسیت، ئەو پیاوە نوورانییە جوانەی کورد، تەنیا گۆرانیبێژ و ئاوازدانەرێکی بەتوانا نییە، ئەو شاعیرێکی هەست ناسک

و چیرۆکنووسێکی بەهێز و خۆشنووس و نیگارکێشێکی دەسترەنگین و سینەماڤانێکی بەسەلیقە و درامانووس و ئیعلامییەکی دیارە و لە بواری مێژوو و فەرهەنگی کوردی و بنەماکانی زمانی کوردی و شێوەزارەکانیدا کەم کەس شان لە شانی دەدەن، ئاخر ئەو پیاوە ریشسپی و پرچ درێژ و روح جوانە، عومری لەم پێناوەنەدا داناوە، من هیچ پێوەندیم بە ژیانی تایبەتیی ئەو پیاوە و شێوازی بیرکردنەوەی نییە، بەڵام دڵنیام لەوەی لەنێو میللەتە زیندووەکانی دنیادا ئەگەر رۆشنبیر و هونەرمەندی وەک عەباسی کەمەندییان هەبێ، رێزی (مرۆڤە مەزنەکانی گەل)ی لێ دەنێن.

کەچی ئەوە ٢١ ساڵە ئەم بەشەی کوردستان ئازاد بووە و تەنیا جارێک نەبێ لە سلێمانی بۆ دیمانەی تەلەڤزیۆنی بانگهێشت کرا، ئیدی جارێ لە جاران بەرپرسێکی باڵای ئەم هەرێمە، بیریان لەوە نەکردەوە هەر بۆ رێزلێنانێکی سادەش بێ، بانگهێشتێکی ئەمدیوی بکەن و نیو سەعاتێک لەگەڵی دابنیشن، لە شەش حەوت وەزیری رۆشنبیری یەکێکیان بیریان لەوە نەکردەوە، ئاهەنگێکی رێزلێنان بۆ ئەم پیاوە گەورەیە رێک بخەن، ئەمە لە سەردەمێکدایە کە بە ملیۆنان دۆلار لە میوانداریی خەڵکی ناهونەرمەندی بێ ئاستدا خەرج کرا و تا ئێستەش دەکرێ..

بەرێز سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی کوردستان...

لەم رۆژانەدا وتارێکی عەباسی کەمەندیم لەبارەی گۆشەگیریی خۆی و بێدەنگیی ئێستەی خوێندەوە، پێشتر کەمەندی ئەو

وتـارەی لـە هەفتەنامـەی (چـرۆ) کـە لـە ئێـران دەردەچێـت بـە زمانـی فارسـی بـڵاو کردووەتـەوە و کاروان حەسـەنیش بـە کـوردی بـڵاوی کردووەتـەوە، خۆزگـە میدیـاکاران و راوێژکارانـی نووسـینگەی بەرێـزت، ئـەو وتارەیـان پیشـان بدایتایـە- بڕوانـە (رۆژنامـەی خەبـات -٢٠/٧/٢٠١٢- پاشـکۆی هـزر و هونـەر)، عەباسـی کەمەنـدی لـەو وتـارەدا هیـچ گلەییـەک لـە بەرپرسـانی هەرێمـی کوردسـتان نـاکات، بەڵکـوو رووی گلەیـی لـە بەرپرسـانی فەرهەنگیـی حکوومەتـی ئێـران و هەمـوو ئـەو بەنـاو رۆشـنبیر و هونەرمەندانەیـە کـە دەسـتیان بڕیـوە و ناسکی و میهرەبانـی و دڵپاکـی و گەورەیـی و لـە هەمـووی ناخۆشـتر بێدەرەتانیـی ئـەم پیاوەیـان ئیسـتغلال کـردووە.

بەڕێز کاک نێچیرڤان...

بەڕاسـتی کفـر و گوناهێکـی گەورەیـە ئێمـە وەزارەتـی رۆشـنبیریمان هەبـێ و خۆمـان بـە کـورد بزانیـن و لـە بەشـێکی تـری کوردسـتان، هونەمەندێکـی مەزنـی وەک عەباسـی کەمەنـدی کرێچـی بـێ و لەبـەر فشـاری قیسـتی خـاوەن مـاڵ و خـاوەن قـەرزەکان گەورەتریـن داهێنانەکانـی هەرزانفـرۆش بـکات و ئەوجـا دەستیشـی ببـڕن.

عەیبـە ئێمـە لێـرە بـە هـەزاران مەتر و دۆنم زەوی بدەینە کەسانێکی گەنـدەڵ بەنـاوی پـرۆژەی هونەرییـەوە و لـەولاش عەباسـی کەمەنـدی ژوورێکـی نەبـێ تیـای بژی..

بەڕێز کاک نێچیرڤان..

لە دوا دێڕی ئەم نامەیەدا کە هیوادارم پێت بگات، یەک دوو تکای بچووکم هەیە.. تکایە بەرلەوەی هەر بڕیارێک بدەیت، بۆ ۲۰ خولەکێک جارێکی تر، گوێ لە دووسێ گۆرانیی عەباسی کەمەندی بگرەوە و پرس بەو کەسانە مەکە کە لە گەورەیی هونەری ئەو هونەرمەندە تێ ناگەن، ئاخر لە کوردستان ئەو کەسانە بەداخەوە یەکجار زۆرن، بەڵام عەباسی کەمەندی هەر یەک دانەیە و جارێکی تر دروست نابێتەوە، ئەگەر ویستیشت کارێکی بۆ بکەیت، تکایە نە لە ڕێگەی وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە بێ و نە لە ڕێگەی ئەو (خزمانەی خۆی!) کە چەند جارێک دەستیان بڕیوە!

# نیوەڕۆخوانێك لەگەڵ عەباسی کەمەندی*

## ئەو ساتانەی باسمان لە شوێنەوارەکانی شاری سنە دەکرد

محەمەد عومەر عوسمان



هەرکەس گوێی لە دەنگە بەسۆز و ستایلە تایبەتییەکەی هونەرمەندی گەورەی کورد عەباسی کەمەندی گرتبێ، هێندە تایبەتە لاساییکردنەوەی بۆ کەسێکی تر قورسە و ئاسان نییە.

کەمەندی وێڕای دەستڕەنگینی و شاعیری و چەندین بەهرەی ڕەنگاوڕەنگ و دەنگە نەمرەکەی کە هەر لە خۆی وەشاوەتەوە، پیاوێک بوو کەمدوو.. کەمبێژ.. بەڵام وریا و سادە هەروەک هونەرەکەی جوان بوو.. کەم کەس دەزانێ ئەو هەر گۆرانیبێژ نەبوو.. بەڵکوو نەقاش، خەمخۆری ئەدەب و کولتووری کوردیش بوو.. ئەو سەرچاوەیەکی بەنرخ بوو بەڵام ئەوی مەحکومی ئەم دەورە زۆر جار سکاڵای لە هونەر و شاعیری

و.. هتد. دەکرد کە ئێمەی (زیندووکوژی مردووپەرست) ئەو بایەخەمان پێ نەداوە کە شایەنی بوو.

لە نیوەڕۆخوانێکدا لە سنە لە ساڵی ١٩٨٦ بۆ یەکەم جار بە خزمەتی گەیشتم، ئەویش لە ماڵی هاوڕێم (حەسەنی ئینتیشاراتی گۆران). حەسەن یەکێک بوو لە بەرهەڵستکارانی ڕژێمی شا و بەداخەوە بەهۆی فیشەکێکەوە کە بەر پشتی کەوتبوو، دوو ساڵ لە جێگەدا مایەوە و وێڕای کەمئەندامبوونیشی لەگەڵ هاوڕێی نووسەرم (حەکیمی مەلاساڵح) توانیان ٤٠ کتێبی کوردی ساخ بکەنەوە و بە چاپی بگەیەنن کە یەکێک لەو کتێبانە بە چەند شیعرێکی بڵاو نەکراوەشەوە دیوانی (مەولەویی شاعیر) بوو.

ئەو نیوەڕۆخوانەی عەباسی کەمەندی و حەسەن و بەندە زۆر تایبەت بوو، زیاتر لە سیمینارێکی ڕۆحی دەچوو بەدەر لە شیعر و هونەر، گفتوگۆیەکی چڕوپڕمان لەبارەی پاراستنی کولتووری کوردی و شوێنەوارەکان دەکرد، ئەو ساتانە زۆر شیرین بوون کە باسمان لە شوێنەوارە زۆر و زەبەندەکانی شاری سنە دەکرد، لەو شوێنانەش مزگەوتی (دار الاحسان) کە تەمەنی زیاتر لە ٢٠٠ ساڵە و بەجوانی ماوەتەوە کە ماوەیەک لە یەکێک لە حوجرەکانیان مەولەویی تاوەگۆزیی شاعیر ژیاوە، هەروەها نالیی شاعیریش سەردانی ئەو حوجرەیەی کردووە، ئەوجا باسی (خانەی کوردی) و چەندین شوێنەواری ترمان کرد کە لە ژمارە نایەن و چۆنیەتیی پاراستنیانمان تاوتوو کرد.

بێگومان عەباسی کەمەندی، پیاوێکی جوان و دوور لە سەرمایە بەرزەکەی هونەر کە ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردبوو، هیچی دی نەبوو. ئەو بێجگە لە ژیانێکی سادە تەنیا ماشێنێکی کۆنی هەبوو کە هەرزانترین جۆری ماشێنە و لە ئێران پێی دەڵێن (ژیان) ئەو لە کاتی نەخۆشییەکەشیدا بەر لە کۆچی دوایی هونەرەکەی خۆی لەبیر نەکردبوو.. وەک سووکە وەفایەکیش دەڵێم: بۆ ئەوەی ڕۆحی کەمەندی زیاتر شاد بێت کاتی ئەوە هاتووە، بەرهەمە بڵاونەکراوەکانی بڵاو بکەنەوە بەرگوێی گوێگران کەون و ڕووناکی ببینن.

* ئەم بابەتە دوای مەرگی کەمەندی لە هەفتەنامەی (باس)دا بڵاو کراوەتەوە.

# ئەو شتانەی لەبارەی کەمەندییەوە نایزانین
# فریشتەکان گوێ لە (هۆ هۆ کاڵە بەی) دەگرن*

عەزیز موڕادی



عەباسی کەمەندی کە هەموان وەکوو هونەرمەندێکی دەنگخۆش دەیناسین، زیاتر حەزی دەکرد شاعیر بێ، شیعر و هۆنینەوەی شیعری لە هەموو شتێک پێ خۆشتر بوو.

فیلمی کۆمێدیی (لوڕول و هاردی)ی بۆ زمانی کوردی دوبلاژ کردووە، لەو فیلمەدا خۆی بە تەنیا لەجیاتی چوار کەسایەتی قسە دەکات.

لە سەردەمی منداڵیدا، لەجیاتی یاریکردن لەگەڵ منداڵانی گەڕەک، خانووی قوڕیین بۆ مێرووەکان دروست دەکات و دەبێتە میری مێرووەکان.

زستانی لـه هەمـوو وەرزەکانـی تـر خۆشـتر دەویسـت و زۆرتریـن نیگارەکانی دیمەنـی زسـتانن، هـەر لـەو وەرزەشـدا زیاتریـن نیـگاری کێشـاوە.

بـێ باوکـی و هـەژاری زیاتـر لـە هـەر شـتێک ئـازاری داوە، تەمەنـی سێ مانگی دەبـێ کـە باوکـی بـە دەسـتی مامـی دەکـوژرێ.

کەمەندی ئەرکی هونەرمەنـدان و ئەرکـی پێغەمبەرانـی وەکـوو یـەک دەزانـی کـە هەردووکیـان خـاوەن پەیامێکـن بـۆ مرۆڤایەتـی، بـەڵام هەرگیـز خـۆی بـە سیاسـەتەوە سـەرقاڵ نەدەکـرد و بـاوەڕی بـە ڕەسـەنایەتیی هونـەر بـوو.

لـە تەمەنـی ١١ سـاڵیدا لـە فیلمێکـی سینەماییدا ڕۆڵێکـی لاوەکیـی پـێ دەدرێ بەنـاوی (دۆزەخ لەژێـر پێـی منـدا). لـە تەمەنـی ١٧ سـاڵیدا لەگـەڵ منداڵانـی گـەڕەک فیلمێـک بەنـاوی (نازەنیـن) دروسـت دەکـەن، لـەو فیلمـەدا ڕۆڵـی سـەرەکی کەمەنـدی دەیگێـڕێ و یەکەمین فیلمـە کـە لـە پارێـزگای سـنە دروسـت کرابێـت.

١٨ سـاڵ لـە تەمەنـی خەریکـی کۆکردنـەوەی ئەدەبـی زارەکیـی کوردسـتان دەبـێ و بەشـێکی زۆر لـەو توێژینەوانـە ئێسـتە لـە کتێبخانـەی فەرهەنگـی خەڵکـی تـاران پارێـزراون.

لـە کێـوی ئاویـەر لـە زەماوەندێکدا گـوێ لە دەنگی شـەهێن تاڵەبانی دەگـرێ کـە گۆرانـی دەچـڕێ، دواتـر ماڵباتـی شـەهێن ڕازی دەکات لەنـاو ڕادیـۆ سـنە گۆرانـی بچـڕێ، لـەو سـەردەمە گۆرانـی چڕیـن بـۆ ژنـان لەمپـەری کۆمەڵایەتیـی سـەختی لەپێـش بـووە، بۆیـە شـەهێن تاڵەبانـی بـە ناسـناوی (ویـدا) ئـەو گۆرانییانـە بـڵاو دەکاتـەوە.

پاش بڵاوبوونەوەی گۆرانیی (سەبریی گوڵفرۆش)، کچە خوێندکارێک وێنەی کەمەندی بە بەرگی کتێبەکەیەوە دەچەسپێنێ، براکانی ئەو کچە گەلەکۆمە لە کەمەندی دەکەن و لووت و دەم و ددانی دەشکێنن.

لەگەڵ گرووپی کامکارەکان چەند شاکارێکیان لە گۆرانی و مۆسیقای کوردیدا تۆمار کرد، بەڵام جیابوونەوەی کەمەندی و ئەو گرووپە لە یەک، ساڵانێکی زۆر عەباسی کەمەندیی لە چرین و گۆرانی دوور خستەوە.

لە یەکەم سەردانی بۆ شاری سلێمانی، کەمێک دڵی دەرەنجێنرێ، بۆیە گەشتنامەیەکی ١٠ رۆژەی لەبارەی ئەو سەردانەیەوە نووسیوە.

٣٥ ساڵ لە رادیۆ و تەلەڤزیۆنی ئێران کار دەکات و چەندین کتێب و رۆمان و تابلۆی نیگاری هەیە و بریار بوو لەگەڵ گرووپێکی پرۆفیشناڵی یۆنانیدا، بەرهەمێکی ناوازەی کوردی پێشکەش بکەن، بەڵام مەرگ مۆڵەتی نەدا.

* ئەم بابەتە دوای مەرگی کەمەندی لە هەفتەنامەی (باس)دا بڵاو بووەوە

# کەمەندی، دەنگە خەمناکەکە بناری ئاویەر*
# دوای سێ ساڵ لە مەرگی، هێشتا سەرتۆپی دەنگی عاشقانە

شەریف فەلاح



عەباسی کەمەندی گۆرانیبێژ، ئاوازدانەر، شاعیر، شێوەکار سینەماکار و مێژوونووس و میدیاکار و شانۆنامەنووسی ناسراوی کوردی خەڵکی سنە کە سێ ساڵ لەمەوبەر و ڕێکەوتی (٢٢/٥/٢٠١٤)ی زایینی بەهۆی نەخۆشیی دڵەوە کۆچی دوایی کرد، ئەو هونەرمەندە دەسترەنگین و خاوەن ئەندێشە قووڵ و چەند ڕەهەندە بوو کە لە هەر بوارێکی هونەردا کە چالاکیی نواندووە، توانیویە بەقەد باڵای خەون و ئاواتە کەسکەکانی هەڵبکشێ و هونەری ڕەسەن بخولقێنێ.

توێژینەوەی فەرهەنگی و هونەری و بەتایبەتی ئەدەبی زارەکی، بەشێک بوون لە چالاکییەکانی کەمەندیی عاشق، ئەو کەمەندییەی کە وەک توێژەر و کۆمەڵناسێکی وردبین و هونەرمەند هەموو ڕەهەند و قوژبنەکانی فەرهەنگی نەتەوەکەی

دەناسـی و دەیکـردە هەوێنـی هونـەر.

لێتوێژینـەوە و بەدیکیۆمێنتکردنـی ژیانـی کەسـایەتییە ناسـراوە کۆمەڵایەتـی و ئەفسـانەییەکانی کـورد وەک « (سـنجەرخان، سـەی عەتـا کـەڵ، پاڵـەوان حوسـێن گوڵـزار کرماشـانی، بەتـاڵان بردنـی شـوێنەواری دێرینـی زێویـە و میـری نـەورۆزی) کـە لـە چوارچێـوەی فیلـم و درامـادا بەرهەمی هێناون، بەشـێکن لـە چالاکییە هونەرییەکانی لـە بـواری سینەمادا کـە ژمـارەی کارەکانـی لـە بـواری کورتەفیلـم و فیلمـی درێـژدا دەگەنـە ٣٠ بەرهـەم.

لـە بـواری نووسـینی شـیعردا خـاوەن زەوق و قەڵەمێکـی جوانـە و لـە بـواری گۆرانییشـدا کـە سـەرجەم ٦٠ گۆرانیـی لـە قاڵبـی چەنـد ئەلبوومـدا تۆمـار کـردووە، خاوەنـی دەنگێکـی رەسـەن و ئاهوورایـە، ئەلبوومەکانـی (گەلاوێـژ، پرشـنگ، هەورامـان و کیـژی کـورد) بەرچاوترینیانـە. لـە بـواری کۆکردنـەوەی بەرهەمـی فۆلکلـۆری بەرهەمگەلێکـی وەک (میراتـی مامەڕەحیـم، پێکدادانـی رومادییـە، کۆچـی سـوور، قەڵـەم و شـەیتان)ی نووسـیووە.

شـێوازی بەرهەمـە شـیعرییەکانی کەمەنـدی ئەویندارنەیـە و زۆریـان لەژێـر کاریگەریـی شـێواز و رێچکـەی شـاعیرانی هەوراماندایـە. ئـەم هونەرمەنـد و نووسـەرە ناسـراوەی کـورد لـە بـواری ئـەدەب و بەتایبەت چیـرۆک و رۆمانیشـدا چـالاک بـووە و چەندیـن بەرهەمـی هەیـە و گوڵبژێرێـک لـە شـیعرەکانی بەنـاوی (هەوارگـەی هـاوار) و پێنـج کتێبی دیکـەی لـە بوارەکانـی رۆمـان، چیـرۆک و درامـادا بـە زمانـی فارسـی سـاڵی ٢٠١٥ لەلایـەن وەشـانگەی (کالـج) لـە سـنە بـڵاو کرانـەوە.

عەباسی کەمەندی کە بە (مامۆستای حەوت هونەر) ناوبانگی دەرکردووە و بەتایبەت لە بواری گۆرانیدا بە ئەفسانەیەکی ناودار و ئەستێرەیەکی درەوشاوەی مەیدانی هونەری گۆرانیی کوردی دادەنرێت. شێواز و رێچکەی جیاواز و تایبەت بە خۆی کردوویەتیە دەنگێکی ئاهوورایی کە لە زەین و بیرەوەریی تاک و کۆمەڵگەی کوردستاندا ریشەیان داکوتاوە. جدیبوون، رەسەنایەتی، قووڵیی واتا، هەڵبژاردنی شیعری هەرمان، دەروەستبوون لە تایبەتمەندییە بەرجەستەکانی بەرهەمی عەباسی کەمەندی بوون.

عەباسی کەمەندی لە ماوەی ژیانیدا جیا لە کاری مامۆستایەتی لە دەوروبەری کرماشان، کاری هونەری سینەمایی، درامای رادیۆیی لە سنە و دۆبلاژ، سەرەرای ئەوەی کە کەسێکی ناسراو و شوێندانەر بوو، بەڵام بە شێوەیەکی سادە و ساکار و دوور لە ئاڵۆزی و ژیانی ماشێنیی ئەمرۆ ژیا. بەهۆی رەخنە و گازندە جیدییەکانی لە کاری هونەری و پرۆژە و پلانە فەرهەنگییەکانەوە، پشتگوێ خرابوو، لە گۆشەگیری و تەریکبووندا دەژیا. بەهۆی ئەم رەخنانەی لەلایەن کۆمەڵگەی فەرهەنگیی کۆماری ئیسلامییەوە لە سنە، ستەم و زوڵمێکی زۆری لێ دەکرا.

چەند جارێک بە فەرمی لەلایەن ناوەندە فەرهەنگی، هونەری و دامودەزگاکانی هەرێمی کوردستانەوە بانگهێشت کراوە و وێرای رێکخستنی کۆڕ، پیشانگەی شێوەکارییشی بۆ کراوەتەوە، یەک لە ناوەندەکان کە گرنگیی بە کەسایەتیی کەمەندی داوە، دەزگای میدیایی (باس) بووە، شایانی باسە ئەم هونەرمەندە بۆ ماوەی

زیاتـر لـە دوو سـاڵ لـە هەفتەنامـەی (بـاس) گۆشـەی تایبەتیـی هەبووە و ئێستاش کۆمەڵێک نووسینی گۆشـەی مـاوە و نـاو بەنـاو بـڵاو دەکرێنـەوە.

کەمەنـدی دەنگێکی ئاسمانی و ئاهووراییـە کـە لـە هەنـاوی دیـرۆک و تراژیدییــە قووڵەکانــی نەتەوەکەیــەوە بـاڵای کـردووە، سـۆزیکی حەزینـە گۆرانیـی پـڕ لـە ڕاز بـۆ ئەڤینـی نادیـاری خـۆی دەڵێـت، چیرۆکـی خەمینـی ئازارێکـە بـە ناخـی قووڵـی دێهات و شـار و ئەڤینی بێخەوشـی لادێیەکانـی کوردسـتان و مێـژوودا ڕۆ دەچێـت.

کەمەنــدی ئاڵاهەڵگـر و چاوگــی سـیاچەمانە، هـۆرەی جـاف و کەلهـوڕ، چەمەریـی یارسـان و بەیتـی موکریـان و لاوکـی ئەڤینەوانـی مەموزیـن و پادیواریـی سـنە و ئاویـەرە.

دەنگـی کەمەنـدی هەرمانـە و هاوراێکـە (هۆهـۆ کاڵەبـەی، ئـای لـە گەلاوێـژ، تـۆ چـاوت نەیشـێ، گوڵـی زەرد و سـووری سلێمان بەگـی بانـە) بوونەتـە نۆتـەی سـەمفۆنیای ئـەم چریکەیـە و دێـڕ بـە دێـری قوڵپـەی گریانـی شـاری پـڕ لـە ئازاری نەتـەوەی کـوردن. دەگمەنن ئەو دەنگانـەی دەبنـە شـاگوڵی باخـی ئـاواز و شـاباڵی کەسـکی سۆزیان شـار و ژیـان دەلەرزێنـێ، دەگمەنـن ئـەو قەڵەمانـەی بـە جەوهـەری خۆشەویستی ژیـان دەنووسـنەوە و مەرگیـش چۆکیـان پـێ نـادات و چیرۆکـی یـار و ئـازاری میللـەت پێناسـەی بوونیانـە.

دەگمەنـن ئـەو هونەرمەندانـەی سـەرەڕای بێدەرەتانـی، دەسـتەنگی و زوڵـم و چەوسـانەوە، بـەڵام ئەڤینـی نیشـتمان وایـان لـێ دەکات ببنـە مەتەرێـزی خـاک و فەرهەنگـی هەرمانـی وەتـەن و مـاڵ و ژیـان

و تەمەنیان بۆ کورد تەرخان بکەن، بەڵام دیارترین ئەو کەسانە، عەباسی کەمەندیی مامۆستای حەوت هونەری کوردە.

* ئەم بابەتە لە سێهەمین کۆچیادی کەمەندی لە هەفتەنامەی (باس)دا بڵاو بووەوە


تا قەبر
هەرچەند پەژارە وەکوو مار دامیە بەر نێش
سووتاندمی، مردم بە هەزار شێوە لەبەر ئێش
لێم زیز مەبە، دەردێ کە لە تۆ بوو بە نەسیبم
نامەردم ئەگەر، تا لچی قەبرانی نەکەم کێش!

## نووسەری ئەم کتێبە لە چەند دێڕێکدا

- نووسـەر و رۆژنامـەوان (بەرهـەم عەلـی) لـە ١٩٧١/٨/٢٠ لـە گەڕەکی سەرچناری شاری سلێمانی لەدایک بووە و هـەر لـەوێ قۆناخەکانـی خوێندنـی (سـەرەتایی، ناوەنـدی، ئامادەیـی) تـەواو کـردووە.
- سـاڵی ١٩٩٢ بڕوانامـەی بەکالۆریۆسـی لـە بـواری ئابووریـدا وەرگرتـووە. (زانکـۆی موستەنسـرییە و زانکـۆی سـەلاحەدین)
- سـاڵی ١٩٩٤ لـە رادیـۆی دەنگـی کوردسـتان کەناڵـی سـلێمانی چەنـد پرۆگرامێکـی کۆمەڵایەتـی و هونەریـی ئامـادە کـردووە.
- لـە سـاڵی ١٩٩٦ەوە تاوەکوو ٢٠٠٦ لـە هەولێـر لە هـەردوو رۆژنامەی (خەبـات) و (برایەتـی)، ئـەم ئەرکانـەی بەجـێ هێنـاوە (پێنـج سـاڵ پەیامنێـری و دواتریـش بەرپرسـی لاپەڕەکانـی ریپۆرتـاژ، دۆسـیەی کۆمەڵایەتـی، هـەواڵ، کـراوە، کاروبـاری خەڵـک).
- هـەر لـەو سـاڵانەدا، مـاوەی دوو سـاڵ سـکرتێریی نووسـینی گۆڤـاری (مەلامەشـهور)ی کاریکاتێـری بـووە، تێیـدا ١١ گۆشـەی تەنـز و ساتیرەشـیعری نووسـیوە.
- هـاوکات ئامـادەکاری بەرنامەکانـی (ئاوێـزە و تەنهـا بـۆ تـۆ) بـووە، لـە تەلەڤزیۆنـی کوردسـتان کەناڵـی مەرکـەزی.

- مـاوەی دوو سـاڵیش پەیامنێـری هـەردوو گۆڤـاری (سـینەما و شـانۆ) و (بـارش) بـووە و دەیـان ڕیپۆرتـاژ و دیمانـەی تێدا بڵاو کردوونەتـەوە، ماوەیەکیـش لـە دۆسـیەی کۆمەڵایەتیـی گۆڤـاری (گـوڵان) کاری کـردووە.
- سـاڵی ١٩٩٨ وەک دیارتریـن ڕۆژنامەنووسـی چـالاک و لاو لەلایـەن وەزارەتـی ڕۆشـنبیری خـەڵات کـراوە.
- حـەوت سـاڵی تـەواو (٢٠٠٠ بـۆ ٢٠٠٧) ئامـادەکار و ڕیپۆرتێـری پرۆگرامـی (پشـووی هەفتـە) بـووە لـە کەناڵـی ئاسـمانیی کوردسـتان تـی ڤـی.
- دەرهێنـەر و نووسـەری چەنـد ڕیپۆرتاژێکـی تەلەڤزیۆنـی و فیلمـی دیکیۆمێنتارییـە، کـە کەناڵـی ئاسـمانیی کوردسـتان تـی ڤـی پەخـش کـراوە، جگـە لـەوەی تێکسـتی بـۆ چەنـد کلیپێکـی منـداڵان نووسـیوە و کاری دەرهێنانیشـی بـۆ کـردوون، هەروەهـا چەندیـن تیکسـتی شیعرییشـی کـراوە بە گۆرانی لەلایـەن گۆرانیبێژە ناودارەکانـی کوردسـتانەوە.
- دوو سـاڵ سـکرتێری نووسـینی گۆڤـاری (گـەپ)ی کاریکاتێـری بووە و نـۆ گۆشـەی کاریکاتێـری و تەنـزی بـە نـاوی جیـاوازەوە بـڵاو دەکـردەوە.
- وەرگری خەڵاتی تەنزنووسانی ساڵی ٢٠١٣یە.
- دوو سـاڵ بەڕێوەبـەری نووسـینی گۆڤـاری (ڕۆناهـی) بـووە، کـە گۆڤارێکـی مانگانـەی کۆمەڵایەتـی بـووە و لەلایـەن ڕێکخـراوی خێرخوازیـی ڕۆناهیـەوە دەردەچـوو.

- ساڵێکی تەواو سەرنووسەری رۆژنامەی (هەولێر) بووە دواتر دەستی لە کار کێشاوەتەوە.
- دوای ئەوە چووەتە دەزگای ئاراس و لەوێ یەک ساڵ سەرنووسەری گۆڤاری (گەشبین)ی کۆمەڵایەتی بووە، کە هەفتانە بە قەبارەی ٨٠ لاپەرەی رەنگاورەنگ بڵاو دەکرایەوە.
- دوای وەستاندنی ئەو گۆڤارە لەلایەن دەزگای ئاراسەوە، یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی (ئاژانسی کوردستان بۆ دەنگوباس-ئاکانیوز) و پتر لە دوو ساڵ و نیو وەک بەڕێوەبەری نووسینی بەشی کوردی لەو ئاژانسە کاری کردووە.
- لە هەردوو هەفتەنامەی (میدیا) و (رووداو) بۆ ماوەی نزیکەی ساڵێک گۆشەی دووهەفتە جارێکی تەنزئامێزی هەبووە.
- دوو ساڵ سەرپەرشتیاری گۆڤاری (سامان) بوو کە گۆڤارێکی ئابووریی وەرزییە و لەلایەن یەکێتیی ژوورە بازرگانی و پیشەسازییەکانی کوردستانەوە دەردەچێت.
- لە ناوەڕاستی ساڵی ٢٠١٠یشەوە، تا ئێستە سەرنووسەری هەفتەنامەی (باس)ە.
- ئەندامی دەستەی دامەزراندنی سەندیکای ئابووریناسانی کوردستانە.
- ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانە.
- ئەندامی فیدراسیۆنی رۆژنامەنووسانی جیهانە
- ئەندامی کۆمەڵەی هونەری کاریکاتێریستانی کوردستانە.

کتێبە چاپکراوەکانی:

١. (٣٦٦٠ ... بیرەوەریی گەنجێکی کوردستانی لە زیندانەکانی بەعسدا) ساڵی ٢٠٠٠ چاپ و بڵاو کراوەتەوە.

٢. (پشیلەی چاوبەڵەک) نامیلکەی شیعری بۆ منداڵان، ساڵی ٢٠١١ لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیی خانەی سمۆرە بۆ رۆشنبیریی منداڵان چاپ و بڵاو کراوەتەوە.

٣. (چۆن فێر بین بڵێین نا؟) لە عەرەبییەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ٢٠١٣

٤. خۆشەویستی لەسەردەمی عەقڵسستی (نۆڤلێت- تەنز) ٢٠١٣

٥. (چیرۆکەکانی گەڕەکی ئێمە) ٦٥ چیرۆکی تەنز ساڵی ٢٠١٨ چاپ و بڵاو کراوەتەوە.

"زستانان هەر کە بەفرەکە تێتە خوارەوە من تەواوی بەدەنم ئەبێ بە قەڵەم و فڵچە بۆ نیگارکێشان، ئەبێ بە پایز شیعرنووسینم پێ خۆشە، پایز زیاتر بە ئەدەبیات و شیعرەوە سەری خۆم گەرم ئەکەم، بەهار گۆرانیم پێ خۆشە، هاوین نووسینی چیرۆك و ئەو شتانەم پێ خۆشە، یانی وەرزەکانە کە هەستی من ئەگۆڕێ و بەرەو ئیشێکی تر و بوارێکی تایبەتی ئەبات".

عەباسی کەمەندی



